# زمانەوانی کوردی




نووسەر : مامۆستا ح.س. سۆران

٢٧٠٩ ی کوردی = ١٣٨٨ی هەتاوی = ٢٠٠٩ زاینی



# زمانەوانی کوردی

مامۆستا حەسەن سەلاح ( سۆران )
٢٧٠٩ ی کوردی = ١٣٨٨ی هەتاوی = ٢٠٠٩ زاینی

ناسنامەی کتێب :

ناوی کتێب : زمانەوانی کوردی .
نووسەر : ح.س.سۆران .
ساڵی بڵاوبوونەوە : ٢٧٠٩ ی کوردی = ١٣٨٨ی هەتاوی = ٢٠٠٩ زاینی .
چاپەمەنی : ئێلێکترۆنیکی .
تیراژ : ٢٠٠٠
زمان : کوردی

ح.س.سۆران
soransa@hotmail.com

# پێشەکی

بەناوی کوردستانی گەورە

هەر وەک هەمیشە وێژراوە ، زمان پێناسە و کەرەسەی هەر گرنگی بوون و هەرمانی گەلانە . هەر لەبەر ئەوە ئەرکی سەرشانی هەرکەسێکە ، لە پێناو پاراستنی زمانی خۆی دا بە گیان و دڵ تێ بکۆشی . منیش هەر بە پێی ئەم بیرۆکە یە ، بە نۆبەی خۆم هەمیشە هەوڵم داوە ، لەگەڵ رێزگرتن لە تەواوی زمانگەلی دیکەش ، بە تایبەت زمانی هاوسێکانمان ، زمانی خۆمان بپارێزم و تا دەتوانم بۆ پەرەدانی تێ بکۆشم ، هەر چەند ئەم تێکۆشانە ، کە مافی گشت خەڵکی جیهانە ، لە زۆر ناوچەی کوردستانی مەزن ، جاری وابوە باسی سەر و لە باروت قاچاغتربوە و زۆرجار زمانی سوور ، سەری سەوزی بە با داوە .

من هەر لە سەردەمی مێرد منداڵیەوە ، هەستم بەوە کرد کە پەرەدان و بە هێز کردنی زمانی کوردی ، یەکێک لە چەکە رەوا پیرۆزە کانە ، کە دەتوانی لە کیانی نەتەوەیی پارێزەری بکا ، بویە لە تەمەنی بیست و پێنج ساڵی دا ، بۆ هەوەڵ جار لە رۆژهەڵاتی کوردستان ، کتێبێکی هۆنراوەم بە زمانی کوردی – بەڵام بە ئەلفوبێی کوردی چاپ کرد ( تا ئەو کاتە قەت لە رۆژهەڵات لە ئەلفوبێی تایبەتی کوردی کەڵک وەرنەگیررابو) ، کە ناوی دیوانی سۆران بو. ئەم پەرتووکە ، بریەتی بو لە برێک لە هۆنراوە کانی خۆم . لەم کتێبەدا باسێکم لەسەر ئەو پەرتووکەش ، نووسیوە . لە پاشان بۆ ماوەی نیو سەدە ، لە زۆر جێگە وانەی زمانی کوردیم وتوەتەوە ، بۆ وێنە لە فێرگەی کۆڕی کوردانی تاران(KKT )، لە بەشی کوردی زانستگەی پاریس ، خودی زانستگەی نێوەندی تاران ، زانستگەی ئیسفەهان ، زانستگەی بەهەشتی تاران ، زانستگەی عیلم و سەنعەتی تاران، زانستگەی نێو نەتەوەیی قەزوێن ، زانستگەی سەلاحەددین لە هەولێر ، زانستگەی دهۆک و کالێجی سۆرانی هەرێمی کوردستان و هتد . پێویستە بە روونکردنەوەیە ، کە وانە وتنەوەم لە و نێوەند و زانستگەگەلەی سەرەوە ، هەر کامیان باروودۆخی تایبەتی خۆی بوە ، بۆ وێنە وەک : مامۆستای میوان ، مامۆستای وانەی نا ئاسایی ( فوق العادە ) ، مامۆستای کلاسی کۆڕی وێژەیی و هتد ، بەڵام ئەو شانازیەم بوە ، کە بەشێکی زۆرم لەو کارانە ، بە شانازی ( افتخاری ) ئەنجام داوە . بە تایبەت لە زانستگە کانی ئێران ، هەر کات رێگە و دەرفەتیان پێ دابێتم ، بە لایەنگری و یارمەتی واتایی خوێندنکارە کوردەکان، زۆرتر وەک وانەی نائاسایی ( فوق العادە ) ئەو کارەم کردوە ، نەک وەک وانەی فەرمی زانستگە ، یانی زمانی فەرمی ( هەر چەند بە پێی خاڵی پازدەی یاسای بنەڕەتی ئێران ، وانە وتنەوە و پەرەدانی زمانی کوردی ، رێیی پێ دراوە !.

ناواخنی ئەم کتێبەش پتر لەسەر بناغەی ئەو تاقیکاریانەی سەرەوە ، کە هەر وەک وتم ، نزیکەی نیو سەدەی درێژە بوە و لە سەر ئەزموونی چاپ و نووسینی چەند کتێبی

زمانـەوانـی کـوردی دیکـە ، وەک پـەڕتـووکـی " زمـان و ئـەدەب " ؛ " باڵـەکۆلارە " ؛ فەرهـەنگۆکیکی فارسـی کـورد و هتد و ناسیاوی لـە تـەک چـەند زمـانی خۆرهـەڵاتـی وئوڕووپـایی پێشکەش کـراون ، بـۆ وێنـە ئولگـوی چـەند وانـەشـم تـێ خستوە ، کـە لـەو نێوەندانەی سەرەوە لە ئێران وتوومنەتەوە ، تا وەک بەڵگەیەک لـەقـەڵـەم بدرێ و ئـەگـەر هەڵگری ئەوەشیان بو ، لە مێژوی زمان و زمانەوانی کوردی دا، بـۆ دیرۆک ئارشیڤ بکرێن .

لە لایەکی دیکەشەوە ، لەسەر زۆر وشە و بابەت راڤەم نووسیوە و لێک دانەوەم کردوە ، کە هێندێکیشیان لـە پێشدا ، لـە زۆر مێدیا دا بـڵاو بوونـەتـەوە ، کـە بڕێـک لـەوانـەش لـەم کتێبەدا هەن .

لـە لایـەکـی دیکـەشـەوە ، بـۆ مـاوەیـەکـی زۆر ، لـە سـەر ماڵپـەڕی رۆژهـەڵات/بۆکـان ( bokan.de ) ، بە چاودێری و بـەرپرسـایەتـی رێزدارانـی دڵسۆز و تێکۆشـەر کـاک برایم فەرشی و کاک نادر فەتحی ( شوانە) ، وانـەی زمـان ، وێژە و فۆلکلۆری کوردیم دەوتەوە ، کە ئـەویش بـەچـەشنی " کتێبۆکێـک " سـاز کـراوە ، بـڵاو بـوەتـەوە وبـە هیـوام ئێستاش لەسەر ماڵپەڕەکە مابێ ، بەڵام ئەوانەم لەم پەڕتووکەدا ، بڵاو نەکردوەتەوە .

تێبینی: ئەگەر لەم پەڕتووکەدا ، چـەند وشـەیـەکـی زۆر کـەم لـە چـەند جێگـە دا شـرۆڤە کراونەتوە ، هۆی ئەوە بوە ، لە روانگەگەلی جۆر بە جۆرەوە ، راڤەم کردوون ، نەک دووبارە کاری بێ .

**رافەی وشەی "بابان ."**

هەروەک دەزانین ، وشەی بابان لە زمانی کوردی دا ، لەو چەشنە وشانەیە کە لە چەند بواری جۆربەجۆر دا ، کەڵکی لێ وەردەگیررێ ، بۆ وێنە :

-بنەماڵەی میرانی بابان.
-بن زاراوەی ناوچەی بابان ، کە لە لقگەلی زاراوەی سۆرانی زمانی کوردیە.
-ناوچەی بابان ، کە بەشێکە لە کوردستانی گەورە و ئێستا دەتوانین سلێمانی بە نێوەند ( نەک ناوەند) ی ئەو هەرێمە ناو بەرین .
-ناو بۆ کوڕ لە زمانی کوردی دا و هتد .

هۆنەری قسە لەڕو و بێ وێنەی کورد، ماموەستا شێخ رەزا تاڵەبانی دەفەرموێ :

لە بیرم دێ سلێمانی کە دارولمولکی بابان بو.
نە مەحکوومی عەجەم ، نە سوغرەکێشی ئالی عوسمان بو .

بەم پێیە دەبێ لەو کاتە دا ، سلێمانی پێتەختی وڵاتی سەربەخۆی کوردستانی بابان بووبێ .

ئێستە با بێینەوە سەر کاکڵی بابەتە کە ، کە بریەتی بو لە راڤەکردنی وشەی "بابان :"

بە پێی نووسینی سەروەر ئەمیر شەرەف خانی بتلیسی ، نووسەری مێژوی باوەڕ پێ کراوی شەرەفنامە " و کتێبی بە ناوبانگی ( مەشاهیری کورد) نووسراوی زانای دڵسۆز سەروەر بابا مەردووخ رۆحانی ، لە بنەڕەت دا وشەی " بابان " ، لە "بابا " و لە ناوی دامەزرێنەری میر نشینی بابانەوە رەگاژۆی کردوە " ، کە ناوی میر بوداق یا پیر بوداق بوە و بۆ رێز لێ گرتن پێیان وتوە "بابا" یا "باوە ."

لە پاشان ئەم وشەیە بە چەشنی کۆ دەر بڕراوە و ناوی ئەو بنە ماڵەیە بوەتە " بابان " ، واتە "باوکان" یا مەزنان و خاوەن رێزان . میرانی بابانیش لە پێشدا زۆر جار بە میرانی "بەبە " باسیان لێ کراوە ، کە کورتکراوەوەی وشەی " بابا " یە و بە مانای "باوک "ە . لە بیرمە زۆر جار کە چیرۆکە فۆلکلۆریە کوردیەکانیان دەخوێندەوە ، وشەی پادشای " بەبە" ،یا میری " بەبە" یان ، زۆر تێ دا بو .

تەنانەت بنەماڵەی ساسانیان ، کە دەڵێن بە رەگەز لە کوردانی شوانکارەی فارس بوون ( و کارێکیشیان بۆ کورد نەکردوە ) ، باوە گەورەیان ناوی "بابەک "ە ، کە کۆکەی بوەتە ( بابەکان) و ئەویش هەر بە مانای "باوکان= باوەکان " ە . لە خودی زمانی

کوردیش دا ، جاری وا هەیە بە " باب " دەڵێن " باوک " کە هەر هەمان " بابەک " ە . لە کوردە واری دا ئەم ناوە زۆر لە کوڕان نراوە ، بۆ وێنە یەکێک لە پیاوانی مەزنی هۆزی رەسەنی مامەش ، لە ناوچەی خانێ ، ناوی " باوک " ئاغا بوە . لە لایەکی دیکەشەوە کەسانێکی ئاپۆرە یا ئاساییشم دیوە ، ناویان " بەبە " بوە ، کە رەنگە بە ناو پادشای "بەبە" ەوە ناویان نابێتن . بەڵام ئێستا لە کوردستان ، لە باتی وشەی " بەبە " یا "باوک " ، زۆرتر ناوی کوڕ دەنێن " بابان" . کە ئەمەش زۆرتر بۆ شانازی کردنە بە بنە ماڵەی هێژا و رێزداری میرانی بابانەوە .بەڵام هێشتا، بە تایبەت لە رۆژ هەڵاتی کوردستان ، کەمتاکورتێک ناوی " بابەک " یش هەر لە کوڕ دەنێن .

ئێستا بۆ رێز لێنان لە میر نشینی بابان و تەواوی خزمەتگوزارانی گەلی کورد ، ئەم شەش دێڕە لە هۆنراوەی " زینی زەمان " پێشکەش دەکەم ، کە زۆر لە مێژە نووسیوومە :

**زینی زەمان :**

مەوتەنی من سەرفەرازە ، دوندی هەورازم هەیە ،
زەردی بەرز و شاخی تەرز و جەننەتی نازم هەیە.
فەخری ناوی ئەردەڵان و موکری و" بابان" ئەکەم ،
خانی لەپ زێڕ و بوداق و میری پێ بازم هەیە .
من لەجێگەی کەشکە خۆرە و داڵی چرچ و کوندەبو ،
سەقر و شمقاڕ و شەهێن و شاهەڵۆ و بازم هەیە .

(ح.س.سۆران)

ئەم وشانەش هەر لە ریشەی وشەی "بابا " ەوە ، رەگاژۆیان کردوە :

بابۆ ( ناوی کوڕ) ؛ باوان ( بنەماڵەی باوکی ئافرەت )؛ باوەلێ ) سەید ) ؛ باپیر ( باوکی باب یا دایک ) ؛ باپیرە گەورە ( باوکی بابی باوک یا دایک )؛ بابە ( باوک ) ؛ باب ( باوک ) و هتد .

زۆر جارا بۆ رێزلێنان لە پیر و چاکیش ئەم وشەیە وەک پێشکۆ ) پێشگر) بەکار دەبرێ ، وەک :

-بابا گوڕ گوڕ ( بابا گڕ گڕ ) ، مەیدانی نەوتی کەرکووک ، کە پێشینان پێیان وابوە ، ئەمە پیر و چاکە بۆیە ، گڕی لێ هەڵ دەستێ.
-بابا قەتار ، چاکێکە .

-باوە یادگار ، پیر (چاک) ی کوردانی بەرێز و رەسەنی کاکەیی ( یارسان) ە ، لە نزیک رێژاوی ناوچەی کرماشان.
-باوە مەحمو ، پیر ( چاک) ی کوردانی بەرێز و رەسەنی کاکەیی( یارسان) ە. لە نزیک دەڤەری خانەقین .
-بابە شێخ ، ناسناو بۆ پیاوی ئایینی ماقووڵ .

**دەشڵێین ، قسە قسە دەهێنێ :**

ئایا وا باشتر نیە لە باشووری کوردستان ، کە هێندێک دەرەتان و دەرفەتمان هەیە ، سێمینارگەلێک بۆ رێزلێ نان لەو میر و فەرمانڕەوا مەزنە کوردانە دابنێین ، کە خزمەتگوزاری مرۆڤایەتی و نەتەوی خۆیان بوون و خودی خۆمان وردتر لە مێژوی ژیانیان بکۆڵینەوە ؟ نەک هەر لە زمانی نەیاران و بیانیانەوە ، بیان ناسین . ئەم چەشنە میر ، ئەمیر ، فەرمانڕەوا و رێبەرانە لە نێو کورد دا زۆر بوون .

گەلۆ ! کورد کوتەنی " هەر مار بە دەستی خەڵک بگرن " .

## راڤەی وشەی "مامۆستا "

لە پێش دا ،کە لە کوردستانی مەزن بەچەشنی ئێستا فێرگەی ئەمڕۆیی نەبوە ، هەر کەس بۆی لوا بێ ، منداڵی نێرینەی خۆی بۆ وانە خوێندن ناردوەتە قوتابخانەی سەر بە مزگەوتە کان ، بەڵام منداڵی مێوینە ئەگەر دەرفەتێکی کەمیشی پێ درابێ ، زۆرتر هەر لە ماڵەوە خوێندویەتی . دەرس وێژی ئەم چەشنە قوتابخانانە کە زۆرتر مەلای مزگەوتە کانیش بوون ، پێیان وتراوە " ماموەستا " ( مام+ وەستا ) ، بۆ وینە : ماموەستا مەلا ئەحمەدی لاسوور ، مەلای بەناوبانگی موکریان یا ماموەستا مەلا محەممەدی کۆیی و هتد . یانی ئەم وشەیە ، لە هەوەڵەوە " مام وەستا" بوە، بەڵام هێدی هێدی بۆ ماموەستایانی فەرهەنگیش بەکاربراوە ، وەک ماموەستا پیرە مێرد ، ماموەستا تۆفیق وەهبی و هتد و وردە وردە بە هەڵە بوەتە " مامۆسا " ، چون وشەی "مام وەستا"یان وەک وشەی " مامۆسا " ئاسان بۆ دەرنەبڕراوە و "گەی" تێ کەوتوە ، دەنا وشەکە لە بنەڕەت دا " مام وەستا" یە ، نەک " مامۆسا " . ئێستا ""، زۆرتر لە زمانی فەڕەنگی دا بە ماموەستا دەڵێن " پڕۆفێسۆر " ، واتە دەرسوێژی لێزان و پسپۆڕ . لە زمانی کوردی دا ،بە دەرسوێژی قوتابخانەی سەرەتایی ، پێش نێوەند و نێوەندی ، زانستگە و ئەوانەش هەر دەڵێن ماموەستا . لە ریشە دا ، ماموەستا بۆ مەلا یا دەرسوێژی نێرینە بە کار براوە ، چون " مام " رێزناوی نێرینەیە ، نەک مێوینە . جا ، بە پێی ئەم راڤەیە ، " ماموەستا " دروستە و بە کاربردنیشی بۆ ئەو ئافرەتە رێزدارانە کە دەرسوێژن ، زانستی نیە و رەنگە وا زانستی تر بێ ، بۆ ئەوان لە جێگەی رێزناوی " مام " کە هی نێرینەیە ، رێزناوی مێوینە بەکاربهێنرێ ، بۆ وێنە رەنگە " خاتو وەستا " یا رێزناوێکی شیاوتری دیکە، ، لە روانگەی زمان ناسیەوە ، بۆ ئەو رێزدارانە لێ کاڵاوەتر و لە بار تربێ .

لەسەرەوە وتم کە بە فەڕەنگی زۆر تر " ماموەستا " واتە پڕۆفێسۆر یا هەر دەرسروێژێکی دیکە . بەس شیاو نیە ئەم وشەیە لە زمانی کوردی دا ، دیوارێکی وەها نزمی بێ ، کە بۆ مرۆڤی نا پسپۆڕ و ئاپۆرەش بە کار ببرێ . بۆ وێنە من رۆژێک لە سلێمانی لە نزیک چایخانەی شەعبی بەڕیدا دەرۆیم ، یەکێک بە دەنگی بەرز بانگی لە دۆستێکی کرد و فەرموی : " مامۆسا " ! ، نزیکەی بیست کەس شاگرد بۆیاغچی(واکسی) ، شاگرد دووکاندار و شت پێیان وا بو لە گەڵ ئەوانیەتی و تێکڕا وەڵامیان داوە : " گیانی مامۆسا ! " . من لێرە دا هەرگیز مەبەستم لەمە نیە کە پلەو پایەی شاگرد بۆیاغچی ، شاگرد دووکاندار و ئەوانە بهێنمە خوارەوە ، بە پێچەوانە زۆریش رێزیان بۆ دادەنێم ، بەڵام پێم وایە دەبێ وشەی رێزناوی شیاوی دیکە بۆ ئەوان و کەسانی دیکە بەکار بەرین ، وەک " کاکە " ؛ "براکەم " ؛ براله ؛ "دادە" ؛ "خوشکێ" و شتی وا، کە زۆرتر لەو بەرێزانە دەکاڵێتەوە .

## پێشگری "هەڵ" ،دروشمی بەرفراوانی زمانی کوردی

زمانی کوردی ، چون خاوەن زاراوە و بن زاراوەگەلی جۆربەجۆرە و لە پانتاییەکی بەربڵاوی جیهان دا ، نزیکەی پەنجا میلیۆن کەس قسەی پێ دەکەن ، زۆر زمانێکی بە پیت ( غەنی ) ە .

بۆ سەلماندنی ئەم بیرۆکەیە ، پێشگری " هەڵ " بۆ وێنە راڤەدەکەم ، تا ئەم راستەقینە زمان ناسیەمان باشتر بۆ دەرکەوێ . کاتێک پێشگری " هەڵ " بە کار دەبەین ، رەنگە بڵێم بە سەدان وشەی رەسەنی کوردی دێنە بە چاومان ، کە من دەتوانم لەم نووسراوە کورتەدا ، تەنیا مشتێک لەو گشتە ، بناسێنم :

هەڵ بەزین
هەڵ بژاردن
هەڵ بەزاندنەوە
هەڵ بەزینەوە
هەڵ بەستن
هەڵ بواردن
هەڵ بوون
هەڵ بڕین
هەڵ پاچین
هەڵ پەڕین
هەڵ تەکاندن
هەڵ تووراندن
هەڵ تۆقین
هەڵ چنین
هەڵ چوون
هەڵ خستن
هەڵ خڕاندن
هەڵ دان
هەڵ دوورین
هەڵ دڕین
هەڵ سپاردن
هەڵ سووڕان
هەڵ شاخاندن
هەڵ شەلین
هەڵ فڕاندن

هەڵ قرتاندن
هەڵ قرچاندن
هەڵ قوڕاندن
هەڵ کاڵین
هەڵ کردن
هەڵ کەوتن
هەڵ کوتن
هەڵ کڕاندن
هەڵ کۆڵین
هەڵ گرتن
هەڵ گرتنەوە
هەڵ گەڕان
هەڵ گەڕانەوە
هەڵ گوشین
هەڵ گوێستن
هەڵ گیران
هەڵ گیرساندن
هەڵ گێڕان
هەڵ گێڕانەوە
هەڵ لەرزاندن
هەڵ لەرزین
هەڵ لووشین
هەڵ ماسین
هەڵ مژین
هەڵ هاتن
هەڵ هاورادن
هەڵ هێنان
هەڵ واسین
هەڵ وەراندن
هەڵ وەرین

تیبینی : هەر وەک لە پێشدا ئاماژەم پێ کرد ، ئەمە مشتێکە لە گشتێک و وەک وێنەیەک ئەم وشانەم لە خزمەت تان دا ناساندوە . روانگەیەکی دیکە ،کە زۆر جیگەی سەرنجە ئەمەیە ، زۆر جار کاتێک پێشگری " هەڵ " بە کردارێکەوە دەنووسێ، تەواو مانای کردارەکە دەگۆڕی ، وەک " هەڵ+کەوتن " کە کەوتن مانایە تری هەیە ، بەڵام "هەڵ کەوتن " بە مانای لێ پەیدا بوون و جاری واهەیە بە مانای لێ کەوتنە ، وەک " هەڵ کەوتنی هۆنەری وەک حاجی قادری کۆیی لە نێو ئێمە دا ،جێگەی شانازیە ؛ " یا " هەڵ کەوتن لە بەرد ، زۆر ناخۆشە " . زۆر وشەی واش هەیە زۆرتر لە واتایەکی هەیە ، وەک خودی " هەڵکەوتن " یا " هەڵ چوون " و هتد .

لە راستی دا ، ئەم باسە زمان ناسیە کورتە ، بەڵگەی مەزنی بە پیتی، رەسەنی و بەرفراوانی زمانی کوردیە ، زمانێک کە نەتەوەی کورد چەند هەزار ساڵ زۆرتر بە دەم ، کۆچێندراوی ،تەقورەو و هەڵات هەڵاتەوە پاراستویەتی و ئێمەش پێویستە بە گیان و دل پەرەی پێ بدەین و بیپارێزین .

---

## بژاری وشه :

هەر وەک هەمیشە وتراوە ، گرنگترین پێناسەی هەر گەلێک زمانەکەیەتی . هەر لەبەر ئەم هۆیە دەبێ بۆ پاراستن ، پەرەدان و قاڵ کردنی زمانی کوردی تێ بکۆشین . دەشزانم کە بەلای کەمەوە لەم بەستێنە دا، هەمومان هاو بیر و هاودەنگین ، هەر لەبەر ئەوە ئەم شتە پێوستی بە راڤە و سەلماندن وشت نیە .

لەم نووسراوەیەدا ، پتر رووم لە کوردگەلی باشووری کوردستانە، کە هەرچۆن بێ چەندین هەنگاو لە پێش بەشەکانی دیکەی کوردستانی بن دەستەوەن و بە رژانی بەلاشی خوێنی خۆیان ، نواندنی خەبات و تێکۆشانی جوامێرانەی درێژ خایەن ، دەڵەمە دەستەڵاتێکیان بە دەست هێناوە و دەتوانن ، لە ئێمە مانان زۆرتر بە چەشنی فەڕمی بە زمانەکە خزمەت بکەن .

یەکێک لەو خزمەتە پیرۆزانە ، بژارکردن و خاوێن کردنەوەی زمانی کوردیە لە وشەی غەوارە، رەمەکی و ناپێویستی بیانی . دیارە ئەم کارە ئەرکی سەر شانی کۆڕی زانیاری کوردە ، کە ئێستا ناوەکەی بوە بە " ئاکادێمای کورد " و لەشاری هەولێری بە وتەی خۆمان " پێتەخت " ، کۆشکێکی زۆر بە شکۆ ، بەرز ، پان و بەرینی بۆ دروست کراوە ، بەڵام رەنگە ئەوانیش لەبەر سەقاڵی و کاری هەرە پێویستی دیکە، فریای ئەنجام دانی ئەمە نەکەون .

لە لایەکی دیکەوە دەشڵێن قسە قسە دێنی :ئەم خزمەتگوزارەشتان بە چەشنی فەڕمی ، یەکێک لە ئەندامگەلی کۆڕی زانیاریم ، بەڵام هەر وەک لە قەراغ چۆمی ئامازۆن بم ، نە تا ئێستا کارێکیان بە من سپاردوە و نە هیچ ، ناشزانم ئەز بەر شەپۆلی ئەو پاکسازیە کەوتووم ، کە گۆیا فەرمووویانە دەبێ لە لایەن یەکیەتی و کەسانی دیکەشەوە ، ئەندام لە کۆڕ دا ببی و هەمو هەر سیپاڵ زەرد نەبن ، سیپاڵ کەسک و شتیشی لێ بێ ؟ پێویستیەشە دووبارە روونی بکەمەوە ، کە من سیپاڵی سەبەخۆی کوردایەتیم لە بەردایە ، نە زەردە ، نە کەسکە ، نە مۆرە ، نە سوور و ... ، ئەز کوردێکی خزمەتگوزاری چکۆلەی کوردستانی گەورەم و تەواوی ئەوانەی خزمەت بە مرۆڤایەتی وکورد دەکەن ، هەر رەنگ لیباسیان لەبەر دابێ ، بێ جیاوازی چاوی منن و لەسەر سەریان دادەنێم .

پاش ئەم کورتە روونکردنەوەیە ، بە بیر و بۆچوونی من ، ئەگەر هێندێک لە وشەگەلی زمانی کوردی بەم چەشنەی خوارەوە بژار بکەین ، زۆر پێویستە . دیارە ئەمە بۆچوونی تاقەکەسی منە و رەنگە بۆچوونی باشتریش ببێ ، کە جێی خۆیەتی و دەینێمە سەر چاوم :

تێبینی " ئەم ریزە تەنیا مشتێکی هەرە چکۆلە ، لە گشتێکی زۆر زەمەننە .

**زیندان** = گرتووخانە ، رەنگە زیندان ، هەر "زەندان" بێ ؟
جەوان = لاو ،بە کوردی "جوان"بە پێکەوتودەڵێن، "جەوان" چیە ؟
ژن = ئافرەت،ژن بە ئافرەتی شو کردو دەڵێن، بەڵام ئافرەت کچشە.
ئیعتیادی = ئاسایی ، لە رۆژهەڵات " ئیعتیاد" کێشانی شتە کاسکەرەکانە.
سەییارە = ئۆتۆمۆبیل ، ئەگەر بڕیار وایە وشەی بیانی بە کار بەرین، هی ئەوانە شیاوترە ، شتەکەیان دروست کردوە.
کولیە = زانکۆ ،زانستگە بە University دەڵێن و زانکۆ College (کولیە) .
سایق = لێخۆڕ
بۆردمان = بۆمباران ،بۆمب + باران.
فلکە = مەیدان، لە پێشدا لە مەیدانەکان، "مەیان"فرۆشتوە،وەک شەکردان " .
ئەنفال = قڕان ،بە مانای قڕ کردنە، وەک کارەساتی موکری قڕان .
قەحتی = قات وقڕ ،گرانی سەقەت .
کوردستانی... = بۆ وێنە :کوردستانی بن دەستی تورکیا ، چون هی تورکیا نیە ، داگیری کردوە و بن دەستیەتی .
شەمەنەفەر = رێگە ئاسن ( شوێمەندوێفێر ، فەڕانسەییە) .
دۆندرمە = بەستەنی ،دۆندرمە ، بە تورکی یانی شتێک کە دەیبەستێ .
لێبووردن = چاوپۆشی، لێبووردن، رەنگە هەڵەی تیدا بکرێ **و ئەوکاتە زۆر ناشیرین دەبێ .**
ئالەتی مۆسیقا = کەرەسەی مۆسیقا ، "ئالەت" وشەیەکی جوان نیە .
سەنتەر = نێوەند، سەنتەر، Center ی ئینگلیسیە، عارەبێندراوە.
کەلتوور = فەرهەنگ ، کەلتوور، Culture ی ئینگلیسیە ، کوردێنراوە.
ساتێللایت = مانگەواڵە ، وەک " وردەواڵە "، " زەردەواڵە " و ...
فیلیز = ئاسنەواڵە " " " "
حەفلە = سەیران، شایی .
تەعاروف = خۆ بە یەک ناساندن یا ناسیاو بوون .
مورتاح = بەدڵ بوون یا پەسەند ، بۆ وێنە دەڵێن من لە تۆ مورتاحم ، یانی تۆم لا پەسەندە .
جنسیە = هاووڵاتی ، بۆ وێنە " ئەو هاووڵاتی ئەلمانە "
شوققە = باڵەخانە .
ئەنجومەن = کوڕ.
وەزیر= شالیار ، ەنگە مەبەست لە "یاری شا" بێ ؟ یانی " شا یار "
موحازەرە = وانە وتنەوە .
ناوەند = نێوەند ، "ناو " مەبەست لە ئیسمە ، بۆ ئەمە " نێو" دروستە .
سەیدەلیە = دەواخانە .

بەڵام لەوانەی بڵێم ، لە هەمویان گرنگتر مانگەکانن ، بۆ وێنە کوردی رۆژ هەڵات بە دەگمەن دەزانن کانوونی هەوەڵ ، ئاب و شوبات و فەلان و فیسار کامە مانگن **. بۆ خاتری گڵکۆی حاجی قادری کۆیی، ئیدی مانگە جوانە کوردیە کان بە کار بەرن!!!.**
ئەو شتانەی لێرەدا وتم ، مەبەست لەمە نیە قینمان لە زمانی گەلانی دیکەیە ، بە مسقاڵ وا نیە ، خۆ ئێمە خەڵیفە ئەردۆغان و ئەوان نین ، بەڵام کورد کوتەنی "عیسا بە دینی خۆی و مووسا بە دینی خۆی" .

## چاوانی لای بۆکان

زۆر جارلەزمانی کوردی دا دەبیستین ، کاتێک یەکێک دەیەوێ بە کەسێکی دیکە بڵێ " بە سەر چاوان " ، لە باتی ئەوە دەڵێ " بەسەرچاوانی لای بۆکان " . رەنگە زۆر کەس هۆ و بۆنەی ئەم شتە نەزانێ؟ .

وەک لە پێشینانم بیستوە ، ئەو ئاواییەی کە لە باکووری شاری بۆکان بو و ئێستا ، بە هۆی گەورەبوونەوەی شار ، لەگەڵ بۆکان تێکەڵ بوە ، ناوی "چاوان" بوە . ئەم ناوەش لەوەوە هاتوە ، کە کانیەک یا سەرچاوەیەک، لەم ئاواییە بوە و ناویان ناوە " چاوان" ، وەک ئاوایی سەرچاوە و... جا ئێستا هێندێک بە تەوسەوە جاری واهەی لە باتی ئەوەی بڵێن ، " بەسەر چاوان یا بە سەر چاو" ، دەڵێن " بەسەرچاوانی لای بۆکان " .

بەڵام لەپاشان ، ئەم ئاوایی چاوانە ، بە ناوی عەلی خان سەرداری کوڕی حەمەحوسەین خان سەرداری بۆکانەوە ، کە عوسمانیەکان لە مەراغە لە سێدارەیان دا ، ناوی نراوە " عەلیاوا" و لە دوایش دا برێک فارسێندراوە و بوەتە " عەلیاباد " . ناوی ئاوایی " سەرداراوا ( سەردەراباد) ی ناوچەی بۆکانیش ، کە دەکەوێتە دەڤەری تەرەغە، هەر بە ناوی سەردارە کانەوە ناو نراوە و دەڵێن ، کاتێک عەلی خان سەردار ،بۆکان و ئەوانەی فرۆشتوە ، بۆ ماوەیەک لە گوندی سەرداراوا یا سەردەراباد ژیاوە .

عەلی خان سەردار لە وڵاتی رووسیای سێزاری وانەی خوێندوە و خێزانیشی هەر خەڵکی وڵاتی رووسیا بوە ، کە لەگەڵ خۆیدا هێناویەتەوە بۆ کوردستان .

هەر وەک دەزانین ، عەلی خان سەردار ، ئاخرین مرۆڤی نێرینەی بنەماڵەکەیان بوە و پاش مردنی ئەو ، چەند خانمی بەرێز لەو بنەماڵەیە ماونەتەوە ، کە دوانیان شویان کردوە بە بنەماڵەی رێزداری دێموکری ( دێبۆکری) و یەکیان مێردی کردوە بە بنەماڵەی بەرێزی فەیزوڵڵابەگی ، ئیدی ئەگەر ئافرەتی دیکەشیان بووبێ ، من هەواڵێکی ئەوتۆم نیە . ئێستاش ، کەسێکی نێرینە لەو بنەماڵەیە نەماوە .

## چاپی هەوەڵ کتێب  بە ئەلفوبێی کوردی ، لە  رۆژهەڵاتی کوردستان

هەر لە مێردمنداڵیەوە ، بە لەونێکی زۆر بنەوەشت و بە تاڵووکە ،  هۆگری هۆنراوەی دڵ لاوێنی کلاسیکی کوردی بووم ، بە تایبەت ، هۆنراوە بەرزە نیشتمان ویستی Patriotism ەکانی مامۆستا ئەحمەدی خانی ، مامۆستا حاجی قادری کۆیی و مامۆستا قانع . بەم چەشنە وەک رێگوزەرێکی بە تاسە  ، رێم کەوتە نێو باغی تەزرو بەرزی وێژەی کوردی و لە دیتنی ئەم هەمو گوڵە لەبەردڵە شەنگ و رەنگاوڕەنگە بدوێنە ، فرمێسکی خۆشەویستی نیشتمان دەزا نێو چاوانی ئاواتە خوازم . لە لایەکیشەوە ، ئەگەر پەخشان بە عارەقی رۆح دابنێین ،  دەستە خوشکە گەورەکەی کەی کە هۆنراوەیە  ، دەبێتە فرمێسکی رۆح . جا بەم بۆچوونە ، بڕێک لە فرمێسکە کوردانە کانم  ، بوونە شتێکی وەک شێعری کوردی بەر لە سەردەمی لاوی و کاتی گەنجی . لە ساڵی ١٣٤٠ی کۆچی هەتاوی ( ١٩٦١ زاینی)ەوە ، زۆرجاران ، مامۆستا  (مام + وە ستا) شوکروڵلا بابان ، مامۆستا جەلال کۆچەر ، مامۆستا برایم ستوودە و مامۆستا سوارە ئێلخانیزادە ، ئەو نووسراوانەی منیان بە ناوی شێعری هۆنەری هاوچەرخی ... بە تەرتیب لە رادیۆی کرماشان،  بەغدا ، سنە و تارانەوە بڵاو دەکردەوە ، کە وردە وردە ئەم هەستەم لێ بەدیهات ، کە رەنگە پێویست بێ ئەم هۆنراوانە نەفەوتێن ، بڵاویان بکەمەوە و لەم چەشنە وتە کلیشەییانە .

بەڵام بە کامە یاسا؟ ( چاپکردنی کتێبی  کوردی لەو کاتەدا ، لە ئێران ، لەبارووت قاچاغتر بو ) . تەنانەت ئەگەر بچوایەی رووخسەت( ئیجازە) ش وەربگری ،ئیجازەیان کە نەدەدا هیچ ،  سەریشت نەدەهێنا دواوە . ئەگەر بەرنامەی رادێۆیی کوردیش لە هێندێک شاری ئێران دانرابو ، وەک عەشایرێکی ئاریایی پارێزەری دەڤەری رۆژاوای ئێران ، تەماشای نەتەوەی  کوردیان دەکرد ، نە گەلێکی گەورە !.

بەکامە تێکنیک چاپم بکردایە ؟، لە کامە چاپخانە؟ ، چاپخانەی چی ؟ و چون و ...؟

**سەرەتای کار :**

پایزی ساڵی ١٣٤٥ ی کۆچی هەتاوی ( ١٩٦٦ ی زاینی)،  ئەو کاتە ماڵم لە دێی ساروقامیشی سەر چۆمی جەغەتو ، لە ناوچەی بۆکان ، لە رۆژهەڵاتی کوردستان بو . دەفتەرە  شێعرە پاکنووسکراوە کەم هەڵگرت و چووم بۆ تەورێز ، چون ئەو کاتە چاپخانە لە بۆکان نەبو .

وتم لە تەورێز چاپخانەیەکی وا بدۆزمەوە ، کە زۆر ناشارەزا  و رەبەن بێ و نەزانێ ، کە ئەم نووسراوانەی  من کوردیە و چاپی کوردی لە تریاک قاچاغ ترە . زۆر لە شاری تەورێز گەڕام ،تا چاپخانەیەکی تازە دانراوم  دۆزیەوە ، لە شەقامی شانازی  باکووری ، لە کۆڵانێکی یەکجار زۆر تەنگ و ترش و قیرتاونەکراودا ، کە خاوەنەکی لەبەر رەبەنی و بێ هەواڵی ، بە ترکی دەوت ( تویرچ  ) ، بە تەورێزی دەوت

( تــەربیــز ) و بــە گێلــدم ی دەوت ( جێلــدم ) . ئــەم چاپخانــەیــە نــاوی چاپخانــەی " تابش "بو .

بەرپرسی چاپخانەکە ناوی " ابولفضل " بو ، کە بەزاراوەی ترکی تەورێزی پێیان دەوت " مەش ئەبەرفەرز " ، یانی مەشەدی ئەبولفەزل– ئەگەر ماوە ساغ و بەختەوەر بێ و ئەگەر نا، جێگەی بەهەشت بێ . لەگەڵ ئاغا ئەبولفەزل بڕیارمان دا ، کە لە چاپخانەی تابش ، کتێبەکە بەناوی " دیوانی سۆران " ، چاپ بکەین .

بۆ ئەوەی کە پۆلیس و مۆلیس نەزانێ و بیلامانێ ... ، وتم من بە ڕۆژدا کارم هەیە و ناموەرژێ ، دەبێ بە شەودا کاری لەسەر بکەین . ئەویش پێی ناخۆش نەبو وتی "شەوانە کارگەرێک لێرە دەخەوێ ، تۆش وەرە خەریکی کاری پیتچنین و چاپ بە" . جا من هەمو شەوێک دەچوومە ئەوێ و خەریک دەبووم .

بۆخۆم کاری پیتچنینم ئەنجام دەدا . بەڵام ئەو کاتە نە زینک و لیتۆگرافی لەوێ بو و نە ناوی کامپیوتێریان بە خەویش بیستبو . چاپ هەر بە پیتی قوڕقوشم دەکرا . هەر بەم دەلیلە دەبو بۆخوم تێکنیکێکی چاپی بۆ بدۆزمەوە، کە بتوانم بە پیتی تایبەتی کوردی چاپی بکەم . چون بەر لەوە کتێبی کوردیم نەدیبو، لە ڕۆژهەڵات بە پیتی تایبەتی کوردی چاپ بووبێ .

**تێکنیکی چاپی کتێبە کە :**

١- بۆ دانانی دروشمی (٧) لە سەر پیتەکان ( ئەوکاتە پیتی (ر) ش دروشمی (٧) هەر لەسەری دادەنرا ، نەک لە ژێری)، هێنام سەری پیتی (ح) ی عەرەبیم بڕی ، تا بە شکڵی ( حـ ) دەرهات و ٤٥ دەرەجە بە باری گەڕانی کاتژمێردا دەمسووڕاند ، جا وەک دروشمی (٧) ، لە سەر پیتگەلی (ر) ،( ل) ، (و) ، ( ی) دامدەنا .

٢- بۆ ئەوەی دروشمە (٧) ەکان لەسەر پیتەکان نەبزوێن ، چەند کیلۆ بەن (کشتەک) م لە ڕاستە بازاڕی تەورێز کڕی . لەدوای پیتچنین و دانانی دروشمی ( ٧) لە سەریان ، دەم هێنا زۆر توند و تۆڵ ،بە بەن دەمبەست .

٣- بۆ ئەوەی کە دروشمە (٧) ەکان، میزان لەسەر پیتگەلی پێویست بوێستن و نەجوولێن ، چووم چەند بەستە شەمچە ( شقارتە = گۆگرد) ی کارخانەی تەوەکوللیم کڕی و بەم چەشنە بە شەمچە ڕێگلاژ م دەکرد ، هێشتا بەم بەن و مەنە شەوە ، ئەگەر تآماشای کتێبەکە بکەی ، زۆر جار دروشمە (٧) بزۆزەکان ، لە سەرپیتە پێویستەکان مۆزیان کردوە .

٤- وێنەکەمان بە تێکنیکی گراڤوور، لە سەر کتێبەکە چاپ کرد .

٥- دەزگای چاپەکە، ماشینێکی کۆنەی ئۆریجینال هایدێلبێرگێر Original Heidelberger ی ئەلمانی بو .

٦- کاری سەححافی، شتێکی ئاسان بو و هەر لە تەورێز ئەنجاممان دا .

بەو گشتە پۆلیتیک و تاکتیک و تێکنیکەی سەرەوە ، هەوەڵین کتێبی شێعری لاوێک بە ئەلفوبێی کوردی ، لە ئێران چاپ کرا . لە حاڵێکدا کە ڕەنگە سەد جاریش تەنانەت دیوانی وەحشی بافقی ، لە ئێران بێ هێچ گەز و مەنێک چاپ بووبێ .

**چەشنی بڵاوکردنەوە :**

دوای ئامادەبوونی ، دەبو کتێبەکە بڵاو بکەمەوە . لەو دەمەدا زۆر کەسیان بە جورمی ئەوە گرتبو ، کە کتێبێکی کوردی ببو یا نامەیەکی بە کوردی نووسیبو . جا لە بارودۆخێکی وهادا ، بڵاوکردنەوەی کتێبەکە لە چاپکردنی ئاسانتر نەبو . بۆ ئەوەی کە زەوتی نەکەن ، هەر لە شاری تەورێزەوە ، وەک بۆمبی پۆستی ، بە پۆستدا ناردم بۆ چەندین پەڕتووک فرۆشی و کەسایەتی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان ، تا بڵاوی بکەنەوە . کەم پەڕتووک فرۆش مەترسی ئەوەیان قەبووڵ دەکرد ، کە بڵاوی بکەنەوە و کتێبەکانیان هەروا بۆ ناربوومەوە . بەڵام ، پەڕتووک فرۆشی موەففەقی لە مەهاباد و کاک مەلا محەممەدی محەممەدی لە سەقز ، زۆر بە دڵسۆزی و بوێرانە ، بڕێک لە کتێبەکانیان بڵاو کردەوە . باقیەکەی بە هۆی خەڵک و بە تایبەت بە هۆی قوتابیانی قوتابخانە ناوەندیەکان بڵاو کرانەوە ، کە لە نێو ئەواند بە تایبەت لە هەوڵ و کۆششی کاک فاڕووق کەیخوسرەوی و کاک فاڕووق بابامیری ، کە ئەو کاتە لە سەقز ، لە قوتابخانەی ناوەندی وانەیان دەخوێند، سپاس دەکەم .

**بارستایی :**
١٥٠ لاپەڕە ، بە چەشنی گیرفانی ( جیبی ).

**ساڵی چاپ :**
١٣٤٥ی کۆچی هەتاوی ( ١٩٦٦ی زاینی )

**قیمەت :**
لە سەر کتێبەکە نووسرابو ،" قیمەت ٥ تمەن" . بەڵام چون کارێکی تەواو فەرهەنگی بو ، وتبوومان هەرکەسێکیش پارەی نەبو،بە خۆڕایی پێی بدەن . هێندێک کەسیش ، کە بێ پارە ببون و نەشیان ویستبو بە خۆڕایی وەریگرن ، مریشک ، جووجەڵە و هێلکەو شتی وایان دابو( چون ئەو کاتە پارە کەم بو ) . وای لێ هات ، کولانەیەک مریشک و قەرتاڵەیەک هێلکەی مریشک و بۆقلە و ... م بو . کابرایەک کەروێشکی ماڵیشی دابو بە کتێب .

**دەنگدانەوە :**
چون هەوەڵ کتێبی کوردی بو ،کە بە پیتی کوردی و بەو چەشنە بڵاو دەبوەوە ، زۆر دەنگی داوە - نەک لەبەر ئەوەی کە هۆنراوەکانی دەرەجە یەک بوون . بۆ وێنە ، دوای

نزیکەی مانگێ زوربەی وێژەرانی ئەدەبی رادیۆ کوردیەکان راڤەیەکی موسبەتیان لەسەر کرد ، وەک :

- ماموەستا جەلال کۆچەر ، لە رادیۆی بەغدا .
- ماموەستا شوکرولڵا بابان ، لە رادیۆی کرماشان .
- ماموەستا سوارە ئیلخانیزادە ، لە رادیۆی تاران .

ماموەستا مەحموود زامداریش ، لە کوردستانی ئەودیو ، بە ناوی شێعری بەرەنگاری ، شتێکی لەسەر نووسیبو و زۆرکاری دیکەشی لەسەر کرا .

بە تایبەت ، هێندێک لە خۆێنەران کە قەت تا ئەو کاتە نووسراوەی کوردیان لە رۆژهەڵات گیر نەکەوتبو ، هێندە بە تاسە ،لەسەر یەک خوێندبوویانەوە ، بەو کتێبە شێعرە ،فێری سەودای کوردی ببوون ، کە یەکێک لەوانە هەستیاری رێزدار خاتو فاتمەی ناهید بو ، کە ئێستا دانیشتوی بۆکانە و یەکێک لە ئافرەتە شازەکانی کوردە .

کامە هۆنراوەی نێو کتێبەکە زۆربر سەرنجی راکێشا :

- هۆنراوەی پڕشنگ – رەنگە بە سەدان کچیان بە بۆنەی ئەو هۆنراوەیەوە ناونا پڕشنگ .
- هۆنراوەی وەرە ساقی .
- هۆنراوەی ئاوری نەورۆز .

کە بە سەدان کەس ئێستاش ئەم هۆنراوانەیان لەبەرە .

شوێنی رامیاری :
بە قەولی فارس " هەر کەس کاڵەک بخوا لەرز دەیگرێ" . رەنگدانەوەی رامیاری نووسینی ئەم کتێبەش، رەپێڵگەی ئاسایی ژیانی رابوردو ، ئێستا و داهاتوی منی بە تەواویو گۆڕی ، کە چون ئەمە بە ئەرکێکی نەتەویی دەزانم و حەقم نیە بیدەمەوە بە چاوی کەسدا ، لە کوولەکەی تەڕیشدا باسی ناکەم. تەنیا بۆ خاڵی نەبوونی باسەکە ، دەڵێم " هەمیشە ماڵەکەمان دو دەرگەی بو ، دەرگەی ئاسایی و دەرگەی مەترسی . ئێستاش چەرخی زەمان هەر وا دەسووڕێ" .

ئەمەش یەکێک لە هۆنراوەکانی دیوانی سۆران ، وەک وێنەیەک :

**وەرە ساقی**

وەرە ساقی ، بەکوڵ بێنە دڵی کەیلم بە هۆی بادە ،
بەجامێ مەی خەڵاتم کە و سەری تونگەم لە بۆ بادە ،
شەرابی ئاڵی یاقووتی بدە دەستم ، فەلەک بادە ،
تەپوتوزی خەیاڵات و خەفەتباریم وەبەر بادە ،
بەقییەی ژینی کەم ماوەم ، دەبا دێوانە و مەست بم .

بەڵام موتریب ، دەخیلت بم نەوای سە نتوور و تارم بێ ،
زڕەی چەنگت وەکو سۆزەی نیگاری کەزیە تارم بێ ،
فسوونی دەنگی شمشاڵت خۆراکی پوود و تارم بێ ،
تکەی عوودی سەفابەخشت مەزەی ئەفکاری تارم بێ ،
سەراسەر عومری ئەفسانەم دەبا شەیدا و پڕ هەست بم .

لەوێش مەعشووقی تەنناز و وەفادار و لەباری من ،
دڵم گەش کا بە خوێنگەرمی و بلاوێنێ لە باری من ،
فەلەک بەڵکو بدا ماوەم ، بەدیبێ کار و باری من ،
هەتا دوا زەربی دڵ سۆران ، کە دەڕوا کۆچ و باری من ،
دەبێ هەر تالیبی بادە و شەراب و شێعر و هەڵبەست بم .

تێبینی : رێزدار کاک عومەر تیکان تەپە ( کە ئێستا بە کاک ئەمیر کیا دەناسرێ ، پێشەکی بۆ ئەو کتێبە نووسیبو ) .

## پێشنیاری ئاڵووگۆڕی هێندێک وشه :

هەر وەک دەزانین ، هەمو زمانە زیندوەکانی جیهان ، لە ئاڵووگۆڕ و پەرەسەندن دان . زمانی کوردیش ، کە بە زمانێکی زیندو ناسراوە ، پێویستی بە ئاڵووگۆڕ و بووژاندنەوەیە . بۆ ئەنجامی برێک لەم ئامانجە ، وەک تاقە کەسێک پێشنیار دەکەم ، وەک مشتێک لە گشتێک ، ئەم وشانە جێ نشین بکرێن :

| ئەو وشەی ئێستا بەکار دەبرێ | پێشنیاری جێ نشینی | هۆ |
|---|---|---|
| لێبووردن | چاوپۆشی | چون لە وشەیەکی ناشیرین دەچێ |
| کەمپین | خەبات | جون وشەکە فەرەنگیە |
| سەنتەر | ناوەند | چون وشەکە فەرەنگیە |
| کولتور | فەرهەنگ | چون وشەکە فەرەنگیە |
| ئایەندە | داهاتو | چون { داهاتو} کوردی ترە . |
| سپیدە | کازیوە | چون وشەکە کوردی ترە . |
| زانکۆ | زانستگە | زانکۆ بە مانای دانشکەدە و کلیەیە |
| مامۆستا | مامۆستا | مام+وەستا |
| مامۆستای( ئافرەت ) | پوور وەستا | پوور=میمک +وەستا |
| کولیە | زانکۆ | کولیە هەر هەمان کالێجی فەرەنگیە . |
| ریکلام | ئاگاداری | چون وشەکە فەرەنگیەی . |
| دەستگیر کردن | گرتن | چون وشەکە کوردی ترە . |
| پیران (سەنا) | بەساڵدا چوان | چون سەناتۆر بە مانای بەساڵداچوە . |
| قسە وێژ | وێژەر | دیارە وێژەر ، هەر قسە دەبێژی . |
| وەزیر | شالیار | وشە کە کوردیە |
| مانگە ناکوردیەکان | مانگە کوردیەکان | مانگە ناوکوردیە کان پێویست نین |
| موتریب | ژەنیار | وشەکە کوردیە . |
| موجری | بەرێوەبەر | وشەکە کوردیە . |
| "دات "، وەک ( دات.کام) | نوختە .کام | چون (دات ) وشەیەکی جوان نیە |

تکام ئەوەیە ، بە وردی تێیان بڕوانن و ئەگەر پێتان باش بوون ، ئاڵوگۆڕیان بکەن .

**لەتیک گۆشت ، بە ناوی زمان وا پرمەترسی نیە !!!**

زوربەی خەڵکی جیهان دەزانن ، کە یەکێک لەو گەلانەی قوربانی زۆری لە پێناوی رزگاری و ئازادی دا داوە ، گەلی لەسەرخۆ و ئاشتی خوازی کوردە . لە لایەکی دیکەشەوە ، ئەگەر بە پێوەری ئاوەز ( ویجدان)ی مێژو دەی پێوی ، کورد قەت وڵاتی کەسی داگیر نەکردوە ، سووتمانی ئەنجام نەداوە ، گەلانی دیکەی قڕ نەکردوە و هەمیشە وەک پەپوولە هێمن ، هێدی ، بێ وەی و ئەهوەن لە زێدی خۆی ژیاوە . هەر وەک دەزانن ، بە دەیان کەرەت "کورد قڕان" ( ئەنفالی کورد) بەسەر مان دا هێنراوە و سەپێنراوە ، بەڵام کورد لە تەواوی ئەو تاوانانە دژ بە خەڵک دوور ، پەڕ و کلا بوە ، کە ئەمە لە تەرازو (کێشەر) ی ئاشتی جیهانی دا ، بە شانازیەکی هەرە تاقانە، مەزن و بێ گەرد لە قەڵەم دەدرێ .

کاتێک دەچینە بنج و بناوان ، بۆمان روون دەبێتەوە ، کە دروشمی هەرە زەق و بەرچاوی کورد بوون ، بۆ کوردقڕانگەلی مێژویی ، زمان بوە . یانی هەرکەس ئەو لەتە گۆشتەی نێو زاری وا بزواندوە و وا گێڕاوە ، کە پێیان وتوە زمانی کوردی ، بە چەندین لەونە پاکتاو و قڕیان کردوە : بە چەشنی گیانی ، فەرهەنگی ، ئابووری و ... . دەنا خۆ هەمو کەس ، لە هەمو جێیەکی گیتی ، یەک زمانی نێو دەم ، دو دانە گوێ ، دو دانە چاو ، دو دانە دەست و ...ی هەیە .

ئێستا ئەم پرسیارە دێتە گورێ ، بۆچی جوولاندن ، بزواندن و گێڕانی زمان ، بە چەشنێک کە زمانی کوردی دروست بکا ، وا بۆ ستەمکاران گرنگە ؟ قوربان گیان ! زۆر لە مێژە بە کوردی وتویانە :
**" زمانی سوور ، سەری سەوز بەرباد دەدا " ؟**

وەڵامەکەی ئەمەیە ، کە وەک فیرعەون و هیتلێر و ئەمانە ، کاتێک لە قسە کردن را ، بۆیان دەرکەوتوە ، کە جوولەکە گەلێکی شازن و لەوانەیە ، ئەوان بخەنە ژێر سێبەری توانایی خۆیان و کزیان بکەن ، قڕ یا تەفر و توونایان کردوون . کوردیش هەر وەک جوولەکە ، بوەتە کۆیلەی لێهاتویی ، شازی ، توانایی و مرخی سروشتی خۆی .

بۆ ئەوی کاکلێ مەبەستەکە روونتر ببێتەوە ، دەڵێم ئەو گشتە چەرمەسەرێ یە، کە لە درێژایی مێژودا ، دەستەڵاتگەلی رەنگاو رەنگ بەسەر کوردیان هێناوە و ئێستاش بێوچان هەر درێژەی هەیە ، لە بەر لەتێک گۆشتی نێو دەم نیە ، بە قورسایی نزیکەی ٢٠٠ گرەم بە ناوی زمان ، بەڵکە بە هۆی شیاوی و لێ هاتویی کوردەوەیە ، کەلە بەر نەتەویستی (موخەلەفەت) و شۆفاری ( بەد نییەتی) ، ویستویانە وەک جوولەکە پرش و بڵاو و سەرکوت و لاوازی بکەن و نە هێڵن قەت دەستاڵاتێکی سەربەخۆی ببێ . نابێ پێمان وا بێ ، ئەم پلانە دژە کوردانە ، بە ئەنقەست دانەرێژراون و بە گۆترە بەرێوە چوون و دەچن . ساکاری و مێرخاسی کوردیش بوەتە هۆی سەرکەوتنی ئەم پیلانە چەپەڵانە ، کە لەمرۆدا دروشمی زۆر بەرچاو ، پیلانی کەرکووکە.

## چەند وشەی لاوەکی یا نارەسەن

لێرە دا مەبەستم لە وشەی لاوەکی و نارەسەن ئەو وشانەیە ، کە کوردی نین یا بە هەڵە بەکار دەبرێن و پێویستە لە بێستانی زەنوێری زمانی کوردی دا بە وردی بە بژارچنێکی تیژ ، بژاریان بکەین . دیارە ئەمە مانای ئەوە نیە، کە زمانی خەڵکمان پێ خراپە یا قینمان لێیەتی قەت وانیە .کورد رێز بۆ گشت زمانێک دادەنێ . بەڵکە ئامانج ئەوەیە ، کە وتویانە عێسا بە دینی خۆی و مووسا بە دینی خۆی :

١- دۆسیە - وشەیەکی فەرەنگیە بە مانای پەروەندەی کوردی کە چوەتە زمانی فارسیەوە . ئەو وشانە کە پاشگری (وەند) یان هەیە ، کوردین ، وەک کاکاوەند . ئایا پێتان چونە لە باتی ئەو وشە فەرەنگیە ، وشەی ( پەردان یا پەرلان) ، یانی جێگەی پەرە کاغەز بە کار بەرین؟ . وەک قەندان ، خوێدان سەرلان و... .
٢- پلان - وشەیەکی فەرەنگیە بەمانای بەرنامە ، بەرنامە وشەیەکی کوردیە کە چوەتە فارسیەوە. هەر بەرنامە بە کار بەرین باشتر نیە ؟
٣- پیلان - وشەیەکی کوردیە ، کە زۆر کەس لە گەڵ پلان تێکەڵی دەکەن . ئەم وشەیە بە مانای دەسیسەی عارەبیە ؟
٤- ها - پاشگرێکی فارسیە و دروشمی کۆ ( جەمعە) ، وەک سینەماها ، فیلمها و ... ، ئایا باشتر نیە وشەی پاشگری کۆی ( گەل) ،(کان ) ( ان) و ئەوانە بە کار بەرین ، کە کوردین ؟ وەک سینەماگەل ، فیلمگەل و ...
٥- ئایندە - وشەیەکی فارسیە ، ئایا باشتر نیە وشەی ( داهاتو) بەکەر بەرین ؟.
٦- زیندان - زەندان !!!= وشەیەکی فارسیە ، ئایا باشتر نیە وشەی گرتووخانە بەکار بەرین ؟.
٧- ناو - بە مانای ( ئیسمی) عارەبی و نێو بە مانای ( داخیل) ە ، ئایا باشتر نیە ئەم دو وشەیە لە یەک جوێ بکەینەوە ؟ . کە وابێ وشەی ( نێوەند ) دروستە ، نەک ( ناوەند ) ، کە دەبێتە ( سێنتر)ی فەرەنگی . کامە سەنتەر!!!
٨- خان - پێشگری پیاو بوە ، وەک چەنگیز خان ، هەلاکۆ خان ، سوڵتان عەبدولحەمید خانی عوسمانی ، ئەمانوڵڵا خانی ئەردەڵان ، هەڵۆ خانی ئەردەڵان ، حەمە حوسەین خانی سە یفی قازی ، حەمە رەشید خانی وێنە و دارۆغان ، سەتتار خانی تەورێزی، میرزا تەقی خانی ئەمی کەبیر ، شەرەف خانی بتلیسی ، د. کەمەران بەدرخان . ئایا وشەی خانم ، خانمانە تر نیە ؟. وەک مەستوورە خانم ئەدرڵان یا ماشەرەف خانم کوردستانی یا عادلە خانمی جاف ؟ . ئایا کوا دەکرێ تاریفی خاتوونێک بکەین و بۆ وێنە بلێین شیرینی وەفایی هۆنەر ، زۆر **خانێکی** نەشمیل بوە !!! رەنگە خانم و خاتوونە رێزدارە کوردەکانیش کە نزیکەی ٢٥ میلیۆنن ، زۆر تر پێیان خۆش بێ پاشگری ( پاشکۆی ) خانم ، خاتوون ، یای و ئەو وشە جوانانەیان ببێ ، کە هەر لە زوەوە لە نێو کورد دا باو بوون ؟ . دیارە ئەوە دەبێ بە بڕیاری ئەو رێزدارانە بێ . نەک بە پێی بیر و ڕای داسەپاوی پیاوان .

٩- ئابشار - ئایا باشتر نیە لە جێگەی وشەی (تاڤگە) ، (ئابشار ) ،( ئاو هەڵدێر) و وشەی (ڕێژاو ) ، بەکار بەرین وەک ڕێژاوی دالاهو ، لە پارێزگەی کرماشان؟ ... .

١٠- تێرۆڕیست -ئایا باشتر نیە لە باتی وشەی تێرۆڕیست ، کە فەرەنگیە و بە مانای ترسێنەر و شتە ، وشەی توقێنەر یا ترسێنەر بەکار بەرین ؟ .

١١- یەکێک لەوانەش مانگە کوردیەکانن ، کە لە زۆر ناوچەی کوردستانی گەورە بە کاریان نابەن – ئایا پێتان ونیە ئەمە کارێکی زۆر ناباشە ؟؟؟ !!!

بۆیە ئەم خاڵانەم بە چەشنی پرسیار نووسیوە ، کە من وەک تاقە کەسێک مافی ئەوەم نیە بڕیاریان لە سەر بدەم ، تەنیا وەک پێشنیار باسم کردوون .

**حەوت (٧) :**

تاوێ تەسکە ، تاوێ پانە ، تا بڵێی جۆرجۆرە حەوت
تاوێ تاڵە ، تاوێ کاڵە ، گا ڕەش وگا بۆرە حەوت

تاوێ لارە ، تاوێ ڕێکە ، تاوێ لەڕ ، تاوێ قەڵەو
تاوێ نوقمە، تاوێ دیارە،کەشکەش و نۆرنۆرە حەوت

گەر بە پیتی (ڕێ)گەیشت و دەرفەت و جێگەی نەبو
دەیکوتێتە ژێر تەنیشتیی و لێ دەبێ بە هۆرە حەوت

وەک کڵاوی مامە هەمزە ، دیکەنە سەر پیتی (لام )
دەنگی نەرمی پێ دەگۆڕێ و دەیمژێ وەک خۆرە حەوت

شین و واوەیلا بە حاڵی پیتی (واو) ی حەوت لەسەر
قوڕبەسەر، قرخەی دەنووسێ ودەنگەکەی وەک(بۆرە) حەوت

چەشنی چێرگ ،کاتێ نیشتە سەر هێلانەی پیتی ( ی )
دەنگی خاو و خێچ دەکا،چون کاروپیشەی زۆرە حەوت

تا بە کەی هەر(حەوت ) بنووسم،ئەوی خودای حەوت ئاسمان ؟
دەنگم گەییە حەوتەوانان ، هێندە کاری زۆرە حەوت

مەڵهەمی ئەم دەردە وایە ، خزمەتی کیبۆڕد بکەین
کوشتنی کات و تەوژمە،وەک چرای بەر خۆرە حەوت

ئەی ئەدیبان ! بێنە مەیدان ، بۆ عیلاجی دەری حەوت
زامی حەوتە دستی سۆران ، نووسەری ناسۆرە حەوت

تێبینی : لە سەردەمێک دا ئەم هۆنراوەیەم نووسیوە ، کە کامپیوتێر بەم چەشنە نەبو و دروشمی ( ٧) یان زۆرتربە چەرمەسرێ و بە پێنووس، لە بان پیتەکان ، دادەنا .

## کورد بۆچی کۆچی دوایی دەکا ؟

بە داخەوە زۆر لە وشە ، لەتە رستە و تەنانەت رستەگەلی زمانی پاراوی کوردی ، مانای هەرە قووڵ و تایبەتی خۆیان هەیە ، کە رەنگدانەوەیەکن ، لە چەوساوەیی ، ژێر چەپۆکە بوون و ستەم لێکراوی ئەم نەتەوەیە . ئەم کارەساتە ، لە ناسناوی زۆر لە هۆنەر ، هونەرمەند و نووسەرەکانیشمان دا ، رەنگ و دەنگی داوەتەوە .

ئەز نامەوێ یەکە بە یەکە ، بە ناسناوی ئەو چەشنە هۆنەر، هونەرمەند و نووسەرانە ئاماژە بکەم ، بۆ ئەوەی کە بیلامانێ نەبێتە لەونێک قسەی ناپێویست . ئەگەر دەکرێ بۆخۆتان بە وردی بیر لە ناسناوی هۆنەران ،هونەرمەندان و نووسەرانی کورد بکەنەوە - کە هەموویان هۆی شانازی و دانەری بناغەی باڵەخانەی بیر و رامانی کوردن - ، جا بۆتان دەردەکەوێ ،و وتەی ئەم خزمەتگوزارەی خۆتان دەسەلمێنن و لە لایەکیشەوە مافی ئەوە بەو چەشنە هونەروەر خۆشەویستانە دەدەن ، کە ناسناوی وا بۆ خۆیان هەڵبژێرن ، کە ئاوێنە و وێنەی ژیانی گەلەکەیان بێ . یانی خۆیان بە هاو دەرد ، هاو خەم و هاو بیری گەل بزانن . بەڵام پێویستە ئەمەش بدرکێنم ، لەم دواییانەدا ، رەنگە تاقلوتۆقل ، کەسانی واش بووبن ، کە ناسناوی کز ، مات و خەماوی و شتی وایان هەڵ نەبژاردبێ . بەڵام بە گشتی دەتوانین بلێین ، ناسناوی هونەروەرانی کورد ، جامی جەهان نەمای ژیانی خەڵکەکەیە و ئەوە دەگەیێنێ ، کە لە تەرکی دڵەوە و دڵسۆزانە ، هاو بەشی ژان وبرکی ژینی نەتەوەکەیان بوون .

دڵنیام دەفەرموون ، دەقی نووسراوە کە، تا ئێستا زۆر لە سەردێرەکە " **کورد بۆچی کۆچی دوایی دەکا ؟** ناکاڵێەتەوە . بەڵام من لێرە دا ، دێمە سەر کاکڵێ مەبەستەکە و سەبارەت بەو، راڤەیەکی هەرە کورت تان پێشکەش دەکەم :

بە زمانی کوردی کاتێ کەسێک دمرێ یا بە هەر چەشنێک لە دنیا دەردەچێ ، ئەو رستەیە بە کار دەبەن و دەڵێن " **کۆچی دوایی کردوە** "، کە لەگەڵ رستەی هاوشانی زمانە کانی دیکە دا تۆفیری زۆر هەیە ، بۆ وێنە : بە فارسی دەڵێن " دەر گوزەشت " ، واتە " بۆی دەرچو " ، یا لە زمانی ئینگلیسی دا دەڵێن " Deceased " ، واتە " وێستا " ، یە بە عارەبی بە مردن دەڵێن " فەوت " ، کە یانی"لەنێو چوون" ، بەڵام هۆی ئەوەی کە بە زمانی کوردی پێی دەڵێن ( **کۆچی دوایی** ) ، ئەوە یە ، کە کورد هێندە ئاوارەبوە، راونراوە و کۆچی پێکراوە و هاتوەتەوە ، ئەمە دەردەبڕێ : کە ئیدی ئەو کەسە وەک جارەکانی دیکە ناگەرێتەوە و **کۆچی دوایی** یا ئاخرین کۆچی کردوە و تازە بە هیچ کلۆجێک بە تەمای مەبن بگەرێتەوە !!!

**دوا قسه :**

ئاواته خوازم ، كه تەواوی ئەوانەی كه به هۆگەلی جۆربەجۆر لە كوردستان كۆچمان پێكراوه یا كۆچێنراوین ، كۆچی دوایی مان نەبێ و وێڕای گەیشتن به ئاواته مەزنەكەی هەموومان ،بگەڕێینەوه بۆ سەر چاكی خۆزگه پیرۆز و رەواكه مان .

## مانای وشەی كورمانج ( كرمانج) چیه ؟

دڵنیام زۆر كەس پێیان خۆشه ، به وردی بزانن وشەی ( كرمانج) مانای چیه . هەر لەبەر ئەمه ، هەوڵ دەدەم سەبارەت بەم وشەیه، راڤەیەكی هەره كورت و زۆر پوختتان، پێشكەش بكەم :

له پێش دا پێویسته ئاماژه بكەم ، ئەم وشەیه له زمانی كوردی دا زۆر وشەیەكی گرنگه ، كه بۆ وێنه به لای كەمەوه لەم بەستێنانه دا به كار دەبرێ : (١) یەكێك له زاراوه سەرەكیه كانی كوردی ناوی زاراوەی ( كرمانج ) یه ؛( ٠٢) لەوانەیه بڵێم ، نزیكەی ٣٠ له سەدی حەشیمەتی كورد به زارەوی ( كرمانج) ی قسه دەكەن ؛ (٣) زۆر كەس ناوی كوڕی خۆیان یا ناسناویان دەنێن ( كرمانج ) ، كه با بڵێم یەكێك له به ناوبانگترینی ئەم (كرمانج) انه ، بەهەشتی عەزیزی كرمانج بو ، كه له كاتی كۆماری دێمۆكڕاتیكی كوردستان دا ، به داشداری ئەو ، دەستەڵاتی شا له شاری مەهاباد دەركراوه و ئەو پیاوه بوێره، شارەوانی ئەو كاتەی له تەك هاورێیانی دا ، داخستوه و تەختە كردوه ؛ (٤) به مرۆڤی كوردی رەبەن و رەسەنیش دەڵێن ( كرمانج ) ، بۆ وێنه هۆنەری مەزن ماموەستا ئەبۆلحەسەن سەیفی قازی ، له هۆنراوەیەكه دا ، شتێكی لەم باره دەڵێ " حەسەن كه كوردێكی (كرمانج )ە، یانی رەبەن ، چ پێویستی به دیلمانجه" ، كه مەبەستی له خۆیەتی ؛ (٥) له فۆلكلۆری كوردی دا ، دەڵێ " به كوردی و ( كرمانج) ی پێت بڵێم "، یانی به كوردیەكی زۆر قاڵ و بێ درۆ و دەلەسه . بەڵام دەبێ ئاماژه بەمەش بكەم ، كه زاراوەی ( كرمانج) ی زۆر بن زاراوه و بگره بنی بن زاراوەشی هەیه ، كه رەنگه زۆر كەسان ، بن زاراوەی بادینی یا شكاكیش ، به جێ نشێنی كرمانجی بزانن ، كه ئەمه وا نیه و ئەم دو بن زاراوەیه ، هەر دووكیان بن زاراوەی ( كرمانج) ین .

**مانای وشەی کورمانجی ( کرمانجی ) :**

هەر وەک دەزانین تەنانەت ماموەستا ئەحمەدی خانی لە پەڕتووکی شازی مەم و زین دا ، نزیکەی ٤٠٠ ساڵ پێش ، وشەی ( کورمانج) ی بە کاربردوە ، کە دیارە کورت کراوەی وشەی ( کوردمانج) یە و لەم بەشانە پێکهاتوە : کورد+مان+جێ ، کە واتە ( جێی و نیشتگەی کورد رەگەزان یا کوردستان ) کە خەڵکەکەشی دەبنە کورمانجی ( کرمانج)ی ، چون:
کورد = کورد
مان = رەگەز ، کە لە وشەی **دوود(مان) ی ئارياييەوە** رەگاژۆی کردوە ، وەک وشەی تورکمان ، کە یانی ( تورک رەگەز ) ، کوردمان یش یانی کورد رەگەز . یا وشەی خانومان ، یانی جێگە و نیشتگە ، وەک دەڵێن فلانە کەس ، بێ ماڵ و بێ خان و (مان) ە .
جێ = جێ یا مەڵبەند یا نیشتمان .

کە بەم پێیە (کورمانج جێ) ، دەبێتە جێ یا نیشتمانی کورد رەگەزان یا کوردستان و، دانیشتوانی ئەو مەڵبەندەش ، دەبنە کۆرمانج ( کرمانج ) و زاراوەکەشیان دەبێتە کورمانجی ( کرمانج)ی .

تێبینی: لە مەهاباد و زۆر ناوچەی کوردستانی گەورەش بە کوردگەلێک کە نە مەلان ، نە شێخن ،نە فەقێن ، نە خاوەن مڵکن و کوردێکی ئاسایین ، پییان دەڵێن ( **کرمانج**) ، جا هەر زاراوەیەکیان ببێ !!!. **کە بەم پییە کرمانج واتە کوردێکی قاڵ، رەسەن و رەبەن .**

دەبێ بە وردی بیان ناسینەوە و بژار بکرێن . بو وێنە نازانم دەزانن یا خەیر ئەم وشانە تورکین : (کوێرپە = منداڵی ساوا و کۆرپە ) ؛ ( قەبرغە - تەنیشت ) ؛( یاسا = زاکوون = قانوون ) ؛ ( قاپ = کاسە ) ؛ ( دەستەڵات = حکوومەت ) ؛ ( بەختەوەر = خۆشبەخت ) ؛ ( بێشکە = لانک ) ؛ ( ئەرک = وەزیفە ) ؛ ئیش = کار ) ؛ ( تووک = مو ) ؛ ( دۆندرمە = دۆڵدرمە = بەستەنی ) ؛ ( ئاڵش وێرش = سەودا ) ؛ ( پارە = پووڵ ) ؛ قاوت = قاوت ) ؛ ( قاورمە = قاورمە ) ؛ (قەرە = گوندنشینی بێ زەوی ) ؛ ( جووت = جووت و گا ) ؛ ( تەشی = تەشی ) ؛ (قەرەچێ = قەرەچێ ) ؛ ( گامێش = گامێش ) ؛ ( قەمیش = قامیش ) ؛ { کەردی = کەردو ) ؛ ( قەنەو = قاناو ) ؛ و ... .

لە لایەکی دیکەشەوە کاتی زو ، تورکەکان ناوی زۆر شار ، گوند ، گەڕەک ، چۆم و جیگەکانی کوردستانیان کردوە بە تورکی ، کە هی وەک ئەردۆغان و عەبدوڵڵا دڕو (گویل) ، لە پاشان تەشقڵەی پێ بکەن و بڵێن بەشێکن لە تورکستان ، وەک تورکمان کەندی ، شاری کەند ، داشبەند و ...

رەنگە وا باش بێ ، کەسێک کە زمانە وانە ، زمانی تورکی و کوردی باش دەزانێ و کاتی هەیە ، کتێبێ بنووسێ بە ناوی " وشە تورکیەکانی ، نێو زمانی کوردی " ، تا ئەم شتە تەواو روون ببێتەوە و بڕیاری بۆ بدرێ .

## وشه هاوبەشەکان، لە زمانی کوردی و فارسی دا

بە خۆشیەوە بە لای کەمەوە ، هەموومان لەمەدا هاودەنگ و هاوبیرین ، کە دەبێ بۆ پارێزگاری کردن لە هەرمانی کوردستان و لە دۆزی گەلی کورد ، زمانێکی پوخت ، قاڵ و پاڵێوراومان ببێ . بەڵام بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجە پیرۆزە ، پێویستمان بە پێوەر و دارولەلەیەک هەیە ، کە ساز و تەیار کردنی ئامراز و کەرەسەی ئەم پێوەرە ، ئەرکی پێویستی سەرشانی هەمو نیشتانپەروەرێکی کوردە و هیچ فرِی بە بیرۆکەی تەسکی ئێگۆیزم (خۆ پەسەندی) ، خۆبەزلزانی و شیڤێنیزمەوە نیە .

بۆ قال کردن و پاڵاوتنی زمانی کوردی ، پێویستە تەواوی ئەو وشانەی کە سەپێنراون بە سەر ئەم زمانەدا یا بە زۆر ئاخنراونەتە نێوی ، وەک وشەی عارەبی ، تورکی و هێندێک زمانی دیکە ، بپالێورێن یا با بڵێم پوخت بژار بکرێن . یانی ئەگەر وشەی کوردیمان لە جێی ئەو وشە بیانیە هەیە ، ئەو وشە کوردیە بە کار بەرین و ئەگەر نیە ، فەرهەنگستانی کوردی لە هەولێرو... ، کە بێ چاوێنێ بێ خاوەنی دەمودەزگە (دەمودەزگا) و باڵەخانەیەکی زل و زەمەننە ، ئەم شتە بگرێتە ئەستوی و بە کەڵک وەرگرتن لە هاوکاری شارەزایان ، پسپۆڕگەل و زمان ناسانان خەریکی پێک هێنان و ناساندنی وشەی شیاو بن ، وەک فەرهەنگستانی فارسی ئێران ، کە ئێستا دەمێکە خەریکی ئەو کارەیە ،

بەڵام سەبارەت بە وشە رەسەنە کوردیەکان ، کە لەگەڵ زمانی فارسی دا هاوبەشن ، شتەکە زۆر تۆفیر دەکا . یانی نابێ پێمان وابێ ئەو وشانە لە ریشە دا فارسین و دەبێ ئەوانیش بپاڵیوین یا بەکاریان نەبەین ، بەڵکە دەبێ ئەمە بزانین ،کە زوربەی ئەو وشانە ، لە پێش ئەوەدا کە فارسی بن کوردی بوون . بە واتایەکی دیکە ، چون زمانی کورد ، فارس ، بلووچ ، گیلەک و ئەوانە ،پاکیان زمانی ئاریایین ، شتێکی ئاساییە کە وشەی هاوبەشیان ببێ ، وەک زمانگەلی ئینگلیسی و ئەلمانی، بەڵام لە هێرشی تاتار، یۆنان ،عارەب ،مغوول و ئەمانە دا ، داگیرکەرانی بیانی ، پێدەشتی و راستاییەکانی وەک فارس ستان و ئەونانەیان گرتوە ،بەڵام کەمتر توانیویانە کوردستان داگیر بکەن و بە وتەی کۆنی کوردی " ناڵ دار هاتوە ناڵی وەراندوە و باڵ دار هاتوە باڵی وەراندوە"، هەر بە پێی ئەم بیرۆکەیە ، زمانی کوردی بە چەشنی قاڵتر ماوەتەوە و زمانە ئاریاییەکەنی پێدەشتیە کان ، بە هۆی داگیرکاری بیانی پڕی بوە لە وشەی بیانی . بابڵێم لافاو و سێڵاوی هێرشی نەتەوە نا ئاریایەکان ، بە کێو پارە ، زەمەن ، بەرزایی و شاخەکانی کوردستان دا ئەوتۆ سەرنەکەوتوە و زمانی کوردی بە قاڵی و رەسنی –بە گۆڕانێکی زۆر کەمەوە- ، وەک خۆی ماوەتەوە .

بەم چەشنە ، زمانی کورد کەمتر کەوتوەتە بەر شەپۆلی سێڵاوی نا ئاریایەکەن و زمانەکەی رەسەن تر و پاراوترە .

جا لەسەر ئەم بناغەیە ، پێویست نیە کە وشە هاوبەشە کوردی و فارسیە کان ، بە وشەی ڕەسەنی فارسی بزانین و وشەگەلێک ، کە بەر لە زمانی فارسی هی زمانی کوردی بوون ، بەکاریان نەبەین و بە جارێ بیدەین بەوان – لە لایەکی دیکەوە ئەو کارە هەر ناشکرێ ، چون بە هەزاران وشەی وامان هەیە ، کە یا دەقاودەق وەک یەک وان ، یا تۆفیرێکێ هەرە چکۆلەیان هەیە ، وەک وشەگەلی : یەک ، دو ، سێ ، دە ، بیست ، سەد ، هەزار ، شیر ، نان ، دەست ، مو ، پا ، پێست ، برا ، خوێن ، ڕەگ ، ئاو و هتد . لەگەڵ ئەمەش دا ، ڕێزمان و تەشکی ئەم دو زمانە زۆر لە یەک نزیکە .

ئەگەر ئەم پرسیارەش ببێ " چۆن زمانی فارسی بەو دەمودەزگە(دەزگە) زل و زەمەنەوە ، لە کوردی ڕەسەنتر نیە ؟ " ، وەڵام ئەمەیە کە زمانی ئامریکاش بەو زلهێزیە ، لە زمانی ئینگلیسی جوێ بوەتەوە ، کە دڵنیانین ، زمانی ئینگلیسی زۆر قاڵ ، پوخت و ڕەسەنتر لە زمانی (زاراوەی) ئامریکاییە ،

بەڵام ئەمە بە مانای ئەوە نیە ، کە کورد نەتەوەیەکی جیاواز نیە ، وەک گەلی فەڕانسە و ئیتالیا ، کە زمانە کەیان زۆر لەیەک دەچێ و خزمی زۆر نزیکی یەکیشن ، بەڵام دو گەلی جیاواز ، سەربەست و سەربەخۆن .

## مانای وشەی " سۆران" چیە ؟

زۆر کەس ڕەنگە ئەم پرسیارەیان ببێ ، ئایا مانای وشەی "سۆران " چیە ؟ بۆ وەڵام دانەوە بەم پرسیارە ، هەوڵ دەدەم بە کەڵک وەرگرتن لە لێ کۆڵینەوەیەکی مەیدانی کە پێشتر ئەنجامم داوە ، ئەم وشەیە لێک بدەمەوە و ڕاڤەی بکەم :

هەروەک دەزانین ، وشەی "سۆران" لە زمانی کوردی دا ، لە زۆر سۆرغەوە بە کار دەبرێ ، کە هێندێکیان ئەمانەن (١) یەکێك لە زاراوە سەرەکیەکانی کووردی ، زاراوەی ( سۆران) یە ؛ (٢) شارێک لە پارێزگەی هەولێر ناوی شاری ( سۆران) ە ؛(٣) ناوچەیەکیش هەر لەم پارێزگەیە پێی دەڵێن دەڤەری (سۆرا ن) ؛ (٤) ناوی بنەماڵەیەک لە فرمانڕەوایانی کوردە ، با ناوی میرانی (سۆران)؛ (٥) زۆرمان ناوی خانزادە خانمی (سۆران ) یشمان بیستوە ؛ (٦) ناوی هێندێک منداڵی کوڕیش دەنێن(سۆران) و بابڵێم ،بۆ وێنە من خۆشم هەر لە منداڵیەوە بە ناسناوی (سۆران) ناسراوم و هتد .

لێکۆڵینەوە مەیدانیەکە :

بەینێک دەرفەرتێک هاتە پێشەوە ،وەک مامۆستای میوان ، لە کولیەی ئادابی سۆران (Soran College Of Education ) ، لە شاری سۆران وانە بڵێمەوە . رێزدار دوکتور دارا جاف کە سەرۆکی ئەو کالێجە بو ، رۆژێک وتی تۆ کە خۆت ناوت ( سۆران) ە و ئێستا لەکالێجی ( سۆران ) ، لە شاری (سۆران ) وانە دەڵێیتەوە ، ئەگەر پێت خۆشە لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی سەبارەت بە وشەی " سۆران " بکە ، بزانە بە بۆچوونی تۆ مانای چیە ؟

مانگی گوڵان بو ، کە لە زۆر جێگەی کوردستانی مەزن بانەمەڕیشی پێ دەڵێن . بارانێکی زۆر لەو دەڤەرە بارییو . دەستم کرد بە لێکۆڵینەوە ، سەبارەت بە وشەی "سۆران " . زۆر لە گوند و شارەدێ کان چووم ، بە دەرودەشت دا گەڕام و لە زاراوەی خەڵکی ناوچەکەم کۆڵیەوە. خۆتان دەزانن کاتێ باران زۆر دەباری و شڵێوە و لەنگێزەی بنەوەشت دەکا ، برێک لە خاک و دەرودەشت و کێو پارەکان زۆرتر رەنگی سووریان لێ دەنیشێ . لەم کاتە دا کە بارانێکی زۆر بارییو ، تەواوی دەرودەشت و کێو و شاخ مەیلەو سوور هەڵگەڕابوون . یانی دنیا وەک گڵەرەنگەی سووری لێ هاتبو ، کە هەورگەڕ دیزەوگۆزەی پێ رەنگ دەکەن . من بەم بۆچوونە گەیشتم ، کە وشەی " سۆران " ، لە " سوور " ەوە هاتوە . و "سۆران " یانی " سووران " یا کورد کوتەنی سوورکەڵانیەکان یا دەڤەرە سوورەکان ، هەر وەک بە کوردی بۆ وێنە دەڵێن " بەردە ڕەشان " ، کە یانی جێگەی بەردەر رەشەکان . لێرەدا پرسیارێک دێتە گۆرێ ، کە ئەی بۆ " سووران " نیە و " سۆران" ە ، کە ئەمەش هۆی ئەوەیە لەو ناوچەیە ، بە رەنگی "سوور " دەڵێن " سۆر " و " سۆران " کۆی وشەی " سۆر" ە ، واتە سوورەکان .

بۆ ئەوەی بزانم خاکی ئەو دەڤەرە بۆ وا سوورە ، هێندێک خۆڵم لە جێگەگەلی جیاوازی ئەو مەڵبەندە هەڵبژاردوە ، ئێستا لە کنمە و دەمەوێ لە لابۆراتۆار ( تاقیگە) یەک ، بیدەم لە روانگەی کیمیاویەوە شرۆڤە (ئەنالیز) ی بکەن .

کوردناسانی خۆماڵی و بیانیش سەبارەت بەم وشەیە، زۆر مەبەستیان نووسیوە و باسی کۆمەڵ ناسی ، مرۆڤناسی ، میژویی و ئەو شتانە شیان هێناوەتە گورێ ، بەڵام خۆتان دەزانن مێژوی زەوی ناسی زۆر زۆر کۆنترە لە هی کۆمەڵناسی ، مرۆڤناسی و مێژویی . بە کورتی بە بۆچوونی من ، ریشەی وشەکە ، لە هەر بەستێنێک دا بەکار ببرێ ، لەوەوە رەگاژۆی کردوە ، کە مەڵبەندەکە زۆر سوورکەڵانە و خاک و دەرودەشت و کێوی ، زۆر زۆر مەیلەو سوورن ، بە تاییەت کاتێک بارانی زۆر دەبارێ ئەمە زەقتر دەبێتەوە و سوورتر هەڵ دەگەڕێ . رەنگە دەڤەری مێرگە "سووریش" کە لە نزیکی ئەو مەڵبەندیە، هەر لەبەر ئەوە وشەی سووری تێدایە ، یانی مێرگێکی مەیلەو سوورە ؟ .

## بۆ خاتری حاجی قادری کۆیی ، وشەی ناپێویستی بیانی بەکار مەبەن

لە پێش دا پێویستە بیدرکێنم ، کە ئەم نووسراویە ریشەی لـە بیرۆکـە و هـەستی نیشتمان پەروەری دایە ، کە ویستێکی پیرۆزی فەلسەفی و ئایینی مرۆڤگەلـی تـەواوی رووکـاری زەویە و زۆرتر گلەیی و گازندەیەکی چەند پاتەیە ، لە هاونیشتمان گەلی خۆشەویستم ، لە باشووری کوردستانی گەورە ، کە هەرچون بێ دەڵەمە دەستەڵاتێکیان هەیە و دەتوانن خۆیان لە بەکاربردنی ناپێویستی وشەی بیانی، بـە تایبـەت عـارەبی بپـارێزن . دیارە ئـەم تکـا، رجـا و لاڵـەیـەی من ، بـە واتـەی ئـەمـە نیـە ، کـە یـەک مـسقاڵ رقمـان لـە زمـان ، فەرهەنگ و داب و نەریتی گەلانی دیکە بێ ، بە پێچەوانە ـ کورد هۆگری رێزلێنـان لـە تەواوی گەلانی جیهانـە ، بـە تایبـەت دەراوسێکان ، بـەڵام قوربـان گیـان کـورد وتـەنـی " **عیسا بە دینی خۆی و مووسا بە دینی خۆی** " .

ئێستا وەک مشتێکی زۆر چکۆلانە ، لە گشتێکی هەرە زەمەن ، بۆ وێنـە چـەند وشـەیـەک دەناسێنم ، کە بۆ زوربەیان یا وشەی کوردی هەیە و بە چەشنی نا پێویست عارەبیـەکـەی بە کار دەبرێ ، یا رەنگە بۆ ئەوەی وێژەر و نووسەر و شت ، نیشانی بدەن عـارەبیش دەزانن و لەم چەشنە شتانە ، یا نازام بڵێم بۆ چی دیکـە ، بـە کاریـان دەهێنن ؟ بـە تایبـەت ناوی مانگەکان . لە رۆژهەڵات، کەم کـەس دەزانـێ بـو وێنـە ، ئـەیلـوول "، "تـەبـاخ " ، "شـوبات " ، " کـانوون " و فـلان و فیـسار ، **بـەری کامـە گیـان** !!!. ئـەو نـاوە جوانـە کوردیانەمان هەیە ، بۆ دەبێ ناوی مانگی ناکوردی بەکار ببرێ ؟

هەروەک وتم ، وشەی وا لە باشوور بە کار دەبرێ ، کـە بـۆ زوربـەیـان نـاوی کوردیمـان هەیە ، یا ئەگەر نەشمان بێ ، ئـەی ئـەو فـەرهـەنگستان( ئاکـادێمی) ە زلـەیـەی هـەولێر ، مەگەر یەکێـک لـە کـارەکـانی ئـەوە نیـە لـە سـەر ناسـاندن ، سـاغکردنەوە و جێگر کردنـی وشـەی کـوردی کـار بکـا ؟ بـۆ وێنـە بڕوانـنـە ئـەم وشـە غـەوارە و دوور لـە کوردیـە عارەبیانە :

ئیدانـە ؟ ، ئیجـابی ، سـەلبـی ، مـەعـاش ، تـەقـاعود ، عـەقید ،فـەحس ، شـوققە ، فندق ، تەعاروف ، کولیە ، عەمید ، سەییارە ، سایق ، موحازەرە ، مورتاح و هەزاران وشەی وا نا پێویست ، کە بۆ زوربەی ئەوان وشەی کوردیمان هەیە یا فەرهەنگستان دەتوانێ وشەیان بۆ دروست بکا .

لـەبیرمـە لـە کۆنفرانـسێک دا ، ژێنێـراڵ دوگـۆلی سـەرۆکـی کـۆچکردوی فـەڕانـسە ، ویستیان بە زمانی ئینگلیسی ، لەگەڵ سەرۆک شالیار ( وەزیر) ی ، ئینگلیس قسە بکـا ، بـاوەکو ئینگلیسیشی زۆر بـاش دەزانـی ، بـۆ ئـەوەی رێز لـە زمانـە کـەی خـۆی بگـرێ ، داوای کرد وەرگێڕیان هێنا ، ئەو بە فەڕانسە قسەی دەکرد و وەرگێڕەکـە ، بـە ئینگلیسی

بە سەرۆک شالیاری ئنگلیسی دەوت . خۆ بەمە ، سەرۆک دوگۆل سووک نەبو ، کەسیش نەیوت زانیاری کەمە - بەڵکە پێی قورس تر بو .

بەداخەوە ، لە بەشەکانی دیکەی کوردستانیش ، ئەم پەتایە بە چەشنی جۆربەجۆر هەیە ، بەڵام جارێ باسی ئەوە دەهێڵمەوە بۆ دەرفەتێکی دیکە.

## زمانی سەرۆکان

وێڕای داوای سەرکەوتنی یەکجاری بۆ تەواوی سەرۆکە رامیاریە دڵسۆزە کوردەکان ، چ ئەوانە شتێکیان کردوە بە شتێک ، چ ئەوانەی دەمێکە بە دەم رێگەوەن ، چ ئەوانەی تازە دەستیان کردوە بە خەباتی کوردایەتی ، تکام وایە بە هەر زاراوەیەکی کوردی وتار دەخوێننەوە یا مەبەست دەنووسن ، هەتا پێیان دەکرێ هەوڵ بدەن بە زمانی کوردی پەتی بیفەرموون و و شەی بیانی تێنەخەن .

دەزانین ، کە گۆڕەپانی رەسەنی زمانی کوردی ، زۆر پان و بەرینە ، لە وشەدا زۆر تەیارە و قەت دانامێنن . وا باشە هەوڵ بدەن لە ئاخەفتن ، دیمانە و نووسینە مێدیاییەکانیان دا ، هەتا بۆیان دەکرێ ، لە وشەی خۆماڵی و خۆجێی کوردی کەڵک وەربگرن . ئەگەر خودای نەخواستە لە ئاخەفتن و نووسینی زمانی رەسەنی کوردی دا گیر و گرفتیان هەیە ، تکام ئەوەیە هەوڵ بدەن بە چەکی زمانەوانی خۆیان تەیار بکەن .

دڵنیا بن ئەم رێبازە هەم دەبێتە هۆی ئەوەی خەڵکیش چاو لەوان بکەن و بە زمانی کوردی رەسەن ئاخەفتن بکەن و بنووسن و باش فێری بن ، هەم وتەکانیان زۆر باشتر لە سەر خەڵک شوێن دادەنێن .

لە مێژەوە وتویان ، گەلان چاو لە رێبەرانیان دەکەن .

بە ئاواتی سەرکەوتنی هەمو دڵسۆزان و خزمەتگوزارانی را ستەقینەی خەڵک .

## چەند وشەیەک ، پێشکەش بە میدیا کوردیەکان

دیسان دەڵێم ، پێشکەش کردنی ئەم نووسراوەیە بە بەرپرسان و دەست وپێوەدنی بیرمەند ( بیر+مەند) و زانای میدیا کوردیە کان ، وەک ئەمە وایە ترێ رەشە بە دیاری بەرم بۆ ناوچەی ئالانی سەردەشت ، مازو بۆ دەڤەری بانە یا بەرو بۆ باژێری ئیلام . بەڵام هەرچۆن بێ ، تکا دەکەم سووکە سەرنجێکی بدەنێ و ئەگەر بە خشلی پەسەندیان رازاوە ، لەمەو دوا لە بابەتەکاندا لەبەر چاوی بگرن ، ئەگەر نا ، خۆێ لێ ببوێرن و بیخەنە لاوە. :

١- لە جێگەی وشەی " دێکومێنت " ، وشەی "بەڵگە "بە کار بەرین ،کە وشەیەکی رەسەنی کوردیە , Document وشەیەکی ئینگلیسیە و بەم چەشنەش دەردەبڕرێ " دۆکیومێنت . "

٢- لە باتی " چەند رۆژ پێش " ، "چەند رۆژی داهاتو" بەکار بەرین . چون" پێش "بە مانای "پێشترە " نەک " دواتر" . چەند رۆژ پێش واتە چەند رۆژی رابوردو .

٣- لە باتی وشەی " ئایەندە " ، وشەی " داهاتو " بەکار بەرین .

٤- بۆوێنە لە باتی ئەوەی بڵێین " پردێک لە سەر سیروان دروست دەکرێ " ؛ بڵێین " پردێک لە سەر سیروان دروست کرا " . چون ئەو کارە تەواو بوە ، ئەگەر بڵێین دروست دەکرێ ، واتە لە داهاتو دا دروست دەکرێ .

٥- لە باتی ئەوەی بڵێین " داوای لێبووردنی کرد " ، بڵێین " داوای چاوپۆشی کرد . "

٦- ئەگەر شتێک بە پیتی لاتین ، لە خوار شاشەی تێلێڤیزۆنەکەوە دەنووسین ، بە پێی یاسای رێنووسی لاتینی زمانی کوردی بینووسین ، نەک بە رەمەکی و بە ویستی خۆمان .

٧- لە باتی " سەنتەر " بلێین " نێوەند " . سەنتەر وشەیەکی فەرنگی عارەبێندراوە .

٨- نەڵێین زمانی کرمانجی ، سۆرانی ، گۆرانی و ... . ئەوانە زارەوەی سەرەکی زمانی کوردین . بەڵام بۆ وێنە بڵێین " زاراوەی کرمانجی زمانی کوردی " و هتد .

٩- بۆ هەر شتێک ، وشەیەکی رەسەنی کوردیمان بەهەر زاراوەیەک هەبێ ، لە بەکار بردنی وشەی عارەبی ، تورکی ، فارسی ، فەڕەنگی و ... خۆ بپارێزین . تا بتوانین زمانی کوردی ، قاڵ و بژار بکەین .

١٠- لە باتی " کولتور " بڵێین " فەرهەنگ " ، کولتور وشەیەکی فەڕەنگیە .

١١- لە باتی " دۆسیە " ، بڵێین " پەڕوەندە " ، دۆسیە وشەیەکی فەڕەنگیە .

١٢- بۆ وێنە نەڵێین " گۆرانیەکمان پێشکەش بکە " ، بڵێین" گۆرانیەکمان بۆ بڵێ " . پێشکەش کردن واتە ( تەقدیم کردن ) ، کە جوان نیە مرۆڤ بڵێ فلانە شتم پێشکەش بکە، وەک ئەوە وایە بڵێی " قسەیەکم عەرز بکە . (

بە هیوام ئەم پێشنیارانە ، وەک خزمەتێکی بچووک لە پێناو پیتاندنی ( غەنی سازی) زمانی کوردی دا ،لە خزمەتگوزاری چکۆلەی خۆتان وەر بگرن .

تێبینی: ئەم پێشنیارانەم لە سەر برێک لەو بابەتانە نووسیوە ، کە هێندێک جار ، کەوتوورەوتو بە دەگمەن لە هێندێک مێدیا دا ، دیومن . پێشنیارێکی گشتیە و مەبەستم لە هیچ مێدیایەکی تایبەت نیە . ماندوونەبینی لە هەمووشیان دکەم .

**پاشگر (پاشکۆ)ی "گە " یا " گا" ؟**

زۆر جاران دەبینین ، هەر کەسێک لە زمانی کوردی دا، بە بۆچوونی خۆی ، پاشگر ( پاشکۆ) ی " گە " یا " گا" بۆ وشە هەڵ دەبژێرێ . من لێرەدا ، هەوڵ دەدەم بە کەرەسە و ئامرازی زمانەوانی ، کورتە راڤەیەک لەسەر ئەم مەبەستە بکەم و ئەگەر لەدەستم بێ ، رێگەچارەیەک بۆ ئەم کێشە و پشێونیە نیشان بدەم ،تا بخرێتە چوارچێوەیەکی یەک گرتوەوە و هەموومان بە چەشنێک بی نووسین .

بەم هۆیانەی خوارەوە پاشگری " گە " دروستە ، نەک پاشگری " گا . " :

بۆ وێنە ، هەمیشە بیستوومانە و دەڵێین "نووسینگە " " بارگە " ، "مۆڵگە " ، "فێرگە " ، "ئێزگە " ، "تاقگە " ، " مینگە " ، "چاوگە " ، "بڕگە " ، " بەرەگە " و هتد . لێرەدا بۆمان دردەکەوێ کە بە پیی نەریتی ئاسایی خەڵک ، پاشگری " گە " دروستە ، نەک " گا " و ئەگەر بۆ وێنە هێندێک کەس دەڵێن " دەرگا " ، " رێگا " ، "ئێزگا " ، ئەمانە دروست نین . پاشگری " گا " لە زمانی کوردی دا ، لەگەڵ پاشگری " گاه " ی زمانی فارسی ، بە هەڵە تێکەڵ بوە و پیتی (ه) ی لێ لابراوە و بوەتە "گا" ، بۆ وێنە لە فارسی دا دەڵێن " ئیستیگاه " ، " کوشتارگاه " ، وەرزشگاه " ، "تەبعید گاه " و هتد .

بە کورتی ، بە پێی ئەو شرۆڤەی سەرەوە ، پاشگری " گە " دروستە، نەک " گا " ، کە بە مانای جێگە یە ، بۆ وێنە " خێڵگە = خێڵ + گە " ، واتە جێگەی خێڵ و هتد . پێویستە ئاماژە بەمەش بکرێ ، کە بە هۆی بەکاربردنی پاشگری " گە" ، لە زمانی کوردی دا ،دەتوانین زۆر وشەی رەسەنی کوردی بناسێنین و بە کاریان بەرین .

## پاشگری " گەر " شیاوترە یا پاشگری " کەر "

هێندێک کەس لە زمانی کوردی دا ئەو دو پاشگر( پاشکۆ) یەی سەرەوە ، لە جێگەگەلی جۆر بە جۆر دا بەکار دەبەن .

بۆ وێنە برێک دەڵێن " قسەکەر " ، " کارەکەر" ، " پەلە کەر = کەسێک کە پەلە دەکا " ، نالە کەر = کەسێک کە نالە ناڵ دەکا " ، " خراپە کەر = کەسێک کە خراپە دەکا . "

هێندێکیش ، پاشگری " گەر " بەکار دەبەن ، وەک " زێرینگەر " ، " شانۆگەر"، "مسگەر " ، " کارگەر " ، " ئاسنگەر . "

ئەمەش دەزانین ، کە پەرژینی قایم بێ پاشگری " کەر " ، بکەر(فاعیل) ی ، کرداری " کردن"ە و مانایەکی هەڵەی رێزمانی نیە ، بەڵام بە هۆی ئەوەی کە بیلامانێ وشەکە جوان نیە و مانای ناجوانیشی هەیە ، لە بەر ئەمە ، ئەگەر بۆ وێنە لەباتی " قسەکەر " بڵێین " قسە گەر " رەنگە باشتر بێ ، چون بەم چەشنە هەم ماناکەی خۆی دەدا و هەم شتەکەش لە پشێوی زمانەوانی رزگار دەبێ و بە

وتەی ئەمڕۆ ، دەبێتە پاسایەکی پاکگرتو یا با بڵێین ستاندارد .

بە کورتی ئەگەر لە باتی پاشگری " کەر " کە وشەیەکی ناشیرینە ، پاشگری "گەر" بەکار بەرین ، کە هەم ناشیرین نیە و هەم واتاکەش دەگەیێنێ ، رەنگە زۆر باشتر بێ . بۆ وێنە بێژین " هەوڕگەر " ، " کارگەر، لە باتی کارکەر " ، " نانگەر ، لە باتی نانکەر " ، " خوازبێنی گەر ، لە باتی خوازبێنی کەر " ، " تەشقەڵە گەر ، لە باتی تەشقەڵە کەر . "

دیارە رەنگە بشتوانین لە هێندێک جێگە دا ، لە باتی پاشگری " کەر " ، پاشگری " کار " بەکاربەرین ، بۆ وێنە بێژین " شانۆ کار " بەڵام هەم " شانۆگەر " لە جوانتر دەچێ و هەم شتەکەش یەک دەست ( ستاندارد ) دەبێ .

## تۆفیری دەربڕینی چەند پێت لە ئاخەفتنی کەڵوڕی دا

زاراوە و بن زاراوەگەلی جۆربەجۆری زمانی کوردی ، زۆریان تایبەت مەندی خۆیان هەیە و زۆرتر هەر ئەم چەشنە تایبەت مەندیانە ، هێندێک تۆفیر لە نێوانیان دا ، پێک دەهێنن . بۆ وێنە ئێستا چەند دانە پیت لە ئاخەفتنی کەڵوڕی دا شرۆڤە دەکەین ، کە لە چاو زاراوەی سۆرانی زمانی کوردی تۆفیریان فرە هەیە :

-پیتی "وو" ی زاراوەی سۆرانی ، کە پێی دەڵین " و" ی درێژ ، لە ئاخەفتنی کەڵوڕی دا ، بە چەشنی پیتی "u" ی زمانی فەڕانسە دەردەبڕرێ ، بۆ وێنە : "دوور" ، دەبێتە شتێکی وەک "دویر" ؛ شوو = شوی ؛ دوو = دوی و هتد .

-

-پیتی " ۆ" ی زاراوەی سۆرانی ، کە پیی دەڵین "و" ی کراوە یا قەڵەو " ، لە ئاخەفتنی کەڵوڕی دا دەبێتە " وو " ،بۆ وێنە " سۆران " دەبێتە " سووران ؛ "بۆران " دەبێتە " بووران " ؛ " گۆران" دەبێتە " گووران "و هتد .

-پیتی " ک "ی زاراوەی سۆرانی ، " لە ئاخری وشەدا زۆر جار دەبێتە" گ " ، بۆ وێنە " دایک " دەبێتە " دالگ " ؛ "میمک" دەبێتە "میمگ " و هتد .

-پیتی "ێ" ی زاراوەی سۆرانی ، کە پێی دەڵێن " ی " ی کراوە یا قەڵەو ،لە ئاخەفتنی کەڵوڕی دا دەبێتە "ی" ؛ وەک " بێستوون = بیستوین " ؛ " بێکار = بیکار " و هتد .

-زۆرجارا ، پیتی " ب " ی زاراوی سۆرانی ، دەبێتە " و" ، وەک" باران = باران . "

-زۆرجار ، پیتی (ڵ) ی زاراوەی سۆرانی کە پیی دەڵێن (ل) ی کراوە یا قەڵەو ، لە ئاخەفتنی کەڵوڕی دا ، دەبێتە "ل" بۆ وێنە " پووڵ = پۆیل . "

-زۆرجا هێندێک کەسیش ، پیتی "غ " وەک " ق" دەردەبڕن ، بۆ وێنە " غەوغا " دەبێتە "قەوقا" ؛ "غەزا " دەبێتە " قەزا " و هتد ، کە رەنگە بەم چەشنە بیانەوێ پیتی "غ" بکوردێنن ، هەر وەک هاو وڵاتە سەردەشتیەکان ، پیتگەلی " ح" و "ع" دەکوردێنن و بۆ وێنە لە جێگەی "حاجی عەلی " ' دەڵێن "عاجی حەلی " و هتد .

زۆر شتی دیکەش لەم بەستێنەداهەن ، کە دڵنیام خودی کولۆڕە خۆشەویستەکان زۆر لە منیان باشتر دەزانن . زۆر شتی وا لە زاراوەو بن زاراوەگەلی دیکەی زمانی کوردیش دا هەیە ، کە گشتیان هەڵگری راڤەیەکی زمان ناسی تێر و تەسەلن و دەبنە هۆی پیتاندنی زمانی کوردی .

## چەند وشەی هەڵە یا نا جوان

هەر وەک دەزانین ، بێجگە لە باشووری کوردستان و کوردستانی بن دەست ئەرمەنستان ، دەرفەتی خوێندنی زمانی کوردی لە قوتابخانەکان ، بە چەشنی فەرمی نەبوە ، تەنانەت لە هێندێک بەشی کوردستانی گەورە ، ئێستاش هەر دەرفەتی ئەوە نەدراوە و بگرە لە بڕیک دەڤەر ،کوردی نووسین و قسە کردن بە تاوانیکی گەورەش دادەنرێ .

لەبەر ئەو کەند و کۆسپانە ، لە نزیکەی پەنجا میلیۆن کورد ، زۆرتریان بۆ خۆیان کوردی نووسین و خوێندنەوە فێر بوون . هەر بەم هۆیە ، زۆر کەسانی وا هەن ، کە

چەشنە وشەیەک یا بە هەڵە بەکار دەهێنن ، یا لە جێگەی ناشێرین دا . کە وەک مشتێک لە گشتێک، ئاماژە بە چەند وینە لەوانە دەکەم :

-دێکومێنت ، لە بنەڕەت دا وشەیەکی فەڕەنگیە و "دۆکیومێنت" ە.
-راشکاو ، لە بنەڕەت دا راکشاوە ، کە مانای بێ گرێ و لچک و ئاسوودە دەدا و بە واتەی " رێلاکس" ی فەڕەنگیە .
-سەری نەوازش دانەواندن ، رستەیەکی ناشیرینە ، بە تایبەت بۆ بە کاربردنی ئافرەت . پێموایە " کڕنۆش کردن" زۆر شیاوترە .
-پێشکەش کردن ، هێندێک جار جوان نیە ، بۆ وێنە بڵێین " پێشکەشم کە " ، کە وەک ئەوە وایە بێژین " دەفەرموومە " یا " عەرزم دەکەی " ، کە بێرێزیە بە پێشکەش گەر ، بەڵام دەتوانین بێژین " پێشکەشت دەکەم . "
-موحازەرە ، کە بۆ ئەمە وشەی رەسەنی کوردیمان هەیە ، و دەتوانین " وانە وتنەوە " بە کار بەرین .
-کولتور ، وشەیەکی فەڕەنگیە و وا جوانە کوردیەکەی بە کار بەرین ، کە دەبێتە " فەرهەنگ " یا " تۆرە . "
-سەنتەر ، وشەیەکی هەڵەی فەڕەنگیە و وا جوانە کوردیەکەی بەکار بەرین ، کە دەبێتە " نێوەند " ، نەک ناوەند .
-مێهرەجان ، کە وشەی کوردیترمان بۆی هەیە . "جەژن " ،هەمان مێهرەجانە .
-قەنات ، کە وشەی رەسەنی " هێل " مان هەیە .
-جەوان ، وشەی رەسەنی کوردی " لاو" مان هەیە . جوان بە کوردی یانی پێکەوتو و شەنگ .
-پێش ، بە مانای رابوردوە ، وەک " دو رۆژ پێش " ، نەک داهاتو . زۆر جار بە هەڵە دەڵێن " پێش دو رۆژ " ، کە مەبەستیان "پاش دو رۆژە."
-ئەنجومەن ، وشەی کۆڕمان هەیە ، بۆ وێنە کۆڕی وەزیران .
-حکومەت ، وشەی کوردی " میری " یا " دەستەلات" مان هەیە .
-وەزیر ، وشەی کوردی " شالیار" مان هەیە .
-پارێزگار ، پارێزگەر دروستە ، وەک " کارگەر " ، زێرینگەر و هتد .
-محامی ، وشەی کوردی " پارێزەر" مان هەیە .
-ئیسترێس ، وشەی" دڵە ڕاوکێ " مان هەیە ، وەک "کێبەرکێ " و هتد .

دیارە ئەم هەویرە شێلانی یەکجار زۆر دەوێ و کاری تاقە کەسیش نیە

## راڤەی وشەی " خان " و " خانم "

لێرە دا باسێکی زمان ناسیتان سەبارەت بە وشەی " خان " و" خانم" پێش کەش دەکەم ، کە بە هیوام جێگەی سەرنجی خوێنەرانی وردبین و هێژا بێ :

لە بنەڕەت دا ، وشەی "خان " وشەیەکی مغوولیە ، کە هاتوەتە نێو زمانی کوردیەوە . چون ،بە داخەوە کوردستانی گەورە ماوەیکی بەرچاو لە ژێر دەستەڵاتی نگریسی مغوولەکانیش دا بوە . ئەمەش دەزانین ، کە زاڵ بوونی رامیاری و ئایینی ، وشەگەلی دەستەڵاتی زاڵ دەهێنێتە نێو زمانی گەلی بن دەست و دای دەسەپێنێ- هەر وەک وشەی عارەبی و تورکی و فارسیش بە خەڵوار هاتوەتە نێو زمانی کوردی .

وشەی "خان" لە زمانی مغوولی دا ، پاشگر ( پاشکۆ) ی رێز ، پللە و پایەی بەرزی مرۆڤی نێرینە بوە، وەک چەنگیز خانی باپیری خەڵیفە ئەردۆغان ، هولاکۆ خانی مغوول کە بەغدای گرتوە و ئاخرین خەڵیفەی بنەماڵەی عەبباسی پاکتاو کردوە . مغوولەکان رێزناو ( لەقەب) ی دیکەشیان زۆر بوە ، وەک "قائان . "

وشەی "خانم " یش رێزناو ( لەقەب) ی ئافرەتان بوە . وەک لە تورکی دا وشەی " بەگ = بێی " بۆ نێرینە بە کار دەبرێ و وشەی " بەێیان " بۆ ئافرەت .

لێرە دا دێمە سەر کاکڵی تەوەرەی باسەکە ، کە راڤەی وشە " خان" و "خانم "ە : هەر وەک ئاماژەم پێ کرد ، وشەی " خان " وشەیەکی مغوولیە ، لە هەوەڵەوە بە چەشنی زۆر بنەوەشت و بەربڵاو لە تەواوی پارچەکانی کوردستانی گەورە ، وەک رێزناو ( لەقەب) ی پیاو ماقووڵ و نێرینەی بنەماڵەی ئەوان بە کار براوە ، بۆ وێنە وەک شەرەف خانی بتلسی ، کامەڕان بەدرخان ؛ ئەمانوڵڵا خان ئەردەڵان ؛ خان ئەحمەد خان ئەردەڵان ؛ سەردار عەزیز خان موکری ؛ سەردار رەشید خان قووچان لە خوراسان ؛ سەردار سەیفەددین خان سەقز ؛ حەمە حوسەین خان سەیفی قازی وەزیری بەرگری ک.د.ک ؛ حەمەڕەشید خان وێنە و دارۆغان ؛ حەمە عەلی خان گەڵباخی ، حەمە خان بانە و سەدان کەسی رێزداری دیکە . وشەی " خانم " لە کوردستان ، لە هەوەڵەوە هەر بۆ ئافرەتی زۆر ماقووڵ بە کار براوە ، کە با بڵێم لە بنە ماڵەی خان بوە . وەک ماشرەف خانم کوردستانی ( مەستوورەی ئەردەڵان) ؛ نوور نیساء خانم یا خانمە چکۆلە کە زانستگەی تورجانی دروست کردوە ؛ عادلە خانم جاف ؛ مینا خانم خێزانی پێشەوا قازی محەممەد و بە سەدان ئافرەتی ماقووڵ و ناوداری دیکە .

هەر وەک وتم ، لە زۆر جێگەی کوردستانی گەورە ، وشەی خانم بۆ ئافرەتگەلی هەرە ماقووڵ بە کار براوە ، شتێکی وەک وشەی " لەیدی " ئینگلیسی بوە. بەڵام ئافرەتگەلی دیکەش ، زوربەیان رێزناو ( لەقەب) ی شیاوی خۆیان بوە ، وەک : یای، خاتو ، خاتوون ، خات ، باجی ، میمکە ، پووریێ و هتد .

له پاشان که وشەی " بەگ " له زمانی تورکیەوە هاتوەتە نێو زمانی کوردی ، هێندێک جار بۆ ئافرەت ، وشەی " خان " بەکار هێنراوە ، وەک " حەفسە خان حەفید " ؛ مریەم خان سترانبێژ و ... . بەڵام بە سەرنج دانی ئەو شرۆڤەیەی سەرەوە ، بە بیر وڕای من هەر وشەی " خانم " یا " خاتو" لە روانگەی زمان ناسیەوە بۆ رێزناو(لەقەب)ی کوردی ئافرەتان شیاوترە . بۆ سەلماندنی زۆر تری ئەم بیرۆکەیە ، باشە بڵێم ئایا دەکرێ له ئافرەتێک هەواڵپرسی بکەین و بڵێین " بەیانیت باش خان ! " ، وا بزانم ئێستاش لە باتی ئەم رستەیە هەر دەڵێن " بەیانیت باش خانم یا خاتوونی بەرێز یا شتێکی دیکەی شیاوی ئەو رێزدارە .

با له پەراوێزی ئەم بابەتە دا ، بەمانەش ئاماژە بکەم : وشەی " پاشا " رێزناوی فرە بەرزی تورکی بۆ نێرینە بوە ،بۆ وێنە رێزدار عوسمان پاشای جاف ، کە یەکێک لە مرۆڤگەلی مەزنی کورد و مێردی عادەلە خانم بوە . پاشکوی بەگ ، کە ئەویش تورکیە ، وەک رێزناوی پیاوان بەکار براوە ، بۆ وێنە وێژەوانی مەزنی کورد ، ماموەستا تۆفیق بەگ ( پیرەمێرد) . وشەی ئەفەندیش ، رێزناوی تورکیە بۆ نێرینە . وشەی " ئاغا"ش ، بۆ پیاو بە کاردەبرێ ، وەک رێزدار قەرەنیا ئاغای مامەش ، سەرۆکی هۆزی رەسەنی مامەش ، له دەڤەری خانێ . سەبارەت بە رێزناوی ئافرەتێک کە قەت شوی نەکردبێ ، له هێندێک زاراوەی زمانی کوردی دا پێی دەڵێن " گەورە کچ " . بەڵام هێشا نەمدیوە له مێدیا کاندا ، کەڵکی لێ وەربگرن . بۆ وێنە ئینگلیسیەکان دەڵێن " بەیانیت باش (میس = گەورەکچ ) ئێلیزابێت" ، بەڵام لە نێو کورد دا قەت نەمبیستوە بڵێن " بەیانیت باش ( گەورە کچ ) نازدار " هەر دەڵێن نازدار خانم یا خاتو نازدار یا لە هێندێک جێگە دەڵێن " نازدار خان " !!! وشەی "کاک " یش ، کە وشەیەکی رەسنی کوردیە ، وەک پێشگر(پێشکو) ی خۆشەویستی ، مێرخاسی ، مەزنی ، جوامێری و رێزی نێرینە بە کار دەبرێ ، وەک " کاک ئەحمەدی سلێمانی ؛ "ئایینی " کاکەیی" ؛ " کاکە مەم" . یا بە چەشنی زۆر ساکار و دروشمی برایەتی و نزیکی ، وەک " کاک رزگار . "

## راڤەی پاشگری "وە "

لەم نووسراوەیەدا ، راڤەیەکتان سەبارەت بە پاشگر(پاشکۆ)ی "وە" ، لە زمانی کوردی دا پێشکەش دەکەم . پێویستە ئەمەش وەبیر بخەمەوە ، کە ئەم راڤەیە ، وەک زوربەی راڤەکانی پێشو، لە روانگەی زاراوەی سۆرانی زمانی کوردیەوە ، دەنووسم ، یانی ئەم فۆڕموولە ناتوانێ بۆ هەمو زاراوەگەی کوردی ، کار ببرێ .

لە زاراوەی سۆرانی زمانی کوردی دا ، پاشگری "وە " ، بە لای کەمەوە ، لەم چەند کەوشەنە دا بە کاردەبرێ :

-وەک دروشمی دووپاتەکردنەوەی کردار(فعل ) بۆ وێنە نووسینەوە ، داخستنەوە ، کڕینەوە ، فرۆشتنەوە و هتد ، کە لێرە دا بە مانای دووبارە ئەنجام دانەوەی ئەو کارانەیە.

-وەک دروشمی ئەنجام دانی یەکجاری و بنەوەشتی کردارێک :
بۆ وێنە سڕینەوە ، دوورخستنەوە ، ماڵینەوە و هتد .

-وەک دروشمی چاوگە ( مصدر) ی کردارێک :
بۆ وێنە لاڵانەوە ، پاڕانەوە ، خولانەوە ، خولاندنەوە، تەقانەوە ،شەکانەوە ، بێژانەوە و هتد .

-وەک چەشنێکی دیکە لە هەمان کردار :
بۆ وێنە خواردن "خواردنەوە "(خوارەدەنەوی ئاو و شتی وا) ؛ خوێندن " خوێندنەوە" ؛ لێک دان "لێک دانەوە " و هتد .

-وەک دروشمی پاشگری کردار یا ناو ، کە کردەوەیەکی لەتەک دا ، نیشان بدا:
بۆ وێنە کردەوە ، بادەوە ( بارین بە باوە ) ، شڵێوە ( بارینی شڵ ، یانی هەم بەفر و هەم باران بە یەکەوە ) و هتد .

چەند لەون و روانگەی جۆربەجۆری دیکەش .

# راڤەی وشەی خاڵ

لە هەزارەی سێ دا زۆر ئاڵوگۆڕی فرە لایەنە بە سەر ژیاندا هاتوە ، کە لەوانـەیـە بێژم ، زۆر لە بەستێنە کان دەگرێتەوە ، وەک بەستێنی داب و نەریت ، خوداناسـی ، رامیـاری ، کۆمەڵناسـی و هتد .

نزیکـەی چـل سـال پـێش ، ئـەم هـۆنراوەیـەم نووسـیبو ، لـە لاپـەڕەی ٣٧ ی کتێبـی "کەماجاڕ" دا بڵاو بوەتە ، کە بە سێهەمین دیوانی چاپکراوی شێعرم لە قەڵەم دەدرێ :

**خاڵ :**

"ئـــەگــــەر خـــەڵکـــی نـــەبـــن مۆکـــڵ ، نـــەکـــەن دەوری گوڵـــت خـــاڵـی ،
نـــەبـــن لای ئـــەو ، نـــەکـــەن لای خـــەو ، بـــرا و دایـــک و کـــەس و خـــاڵـی،
بـــڕۆ ژوانـــــی ، بـــە چـــازانی ، وەکـــو ســـۆران ، نـــەک ئـــاپۆران ،
بکە ماچی دەم و لێو و سەری کۆڵمە و خەتو خاڵی " .

لە دێڕی ئاخری هۆنراوە کە دا ، ئاواتی مـاچ کردنـی " خـەت و خـاڵ " دەخـوازری ، کـە ئەو کاتە لە زۆر ناوچەی کوردەواری ، دا بە خشڵێکی سروشتی زۆر جوان بـۆ ئـافرەت دا دەنـرا و تـەنانـەت لـە هێنـدێک لـە دەڤـەرەکـانی کوردستانی گـەورە ، وەک پارێزگـەی کرماشان ، زۆر ئافرەتی وا بو ، خاڵی دەستکردی لە سر رووومەت ، کوڵم ، دەموچـاو و دەست و پای دەکوتی ، کە زوربەی خاڵەکان بە رەنگی شین و سەوز بوون .

لە هۆنراوەی هۆزانوانـانی کلاسیک ، هۆنراوەی فۆلکلۆری و بـەیت و بـاوەکـانیش دا ، هەتا بڵێی بە خاڵ دا هەڵ وتراوە ، رەنگە بتوانم بڵێم " کـەو" لـە فـەرهـەنگـی کـوردی دا بە دروشمی " خاڵخاسی " و دەنگ خۆشـی ناسـراوە . بۆ وێنـە لـەنێو سـەدان هۆنراوە ، پەند ، بەیت و باو دا ، کە تاریفی جوانی خاڵ هەیە ، وەک مشتێک لە گشتێک ئـەم چـەند دانەیە هەڵ دەبژێرم و وەبیری دەخەمەوە :

- خاڵۆ خاڵۆتەن ، کەم واتە خاڵۆ ، خاڵۆ دەم وەبان خاڵانت ماڵۆ...
- خاڵی نێوانی سینگ و مەمکی دو قامکیان نێوانە.
- خاڵێ لە تۆ دیم یەک لە عەتاران ، یەک لە گوڵ سۆسەن لا پای کۆساران .
- خاڵێ ها وە بان پەنجەی پاتەوە ، قولوەڵلا لە بیر شەخس ئەباتەوە.
- خاڵێ ها وەبان گۆنای پیرۆزەو ، کوردستان ئەژی وە نەکەرۆزەو .
- شەمامە و خاڵ خاڵ شەمام شلکی ، نادوومە بۆت بێ ، زەرد و فێنکی.
- خاڵان خێزیان کرد پیرۆزە ون بو ، گەوهەر لە شاران قیمەتیان کەم بو .

- خاڵێ لەسەر کوڵمیە ، قایمە قەت نانەوێ ، هەر کەس ئەو خاڵە ماچ کا ،قەت خەوی لێ ناکەوێ .
- هاتم بۆ دانەی خاڵت ، تووشی داوی زوڵفت بووم، تەیرێکی نابەڵەد بووم ، نەمزانی دانە و داوە .

بە سەدان هۆنراوە ، پەند بەیت و باوی دیکەش هەن ، کە تاریفی خاڵیان تێدایە .

بەڵام ئێستا لە هەزارەی سێ دا ، وشە و فەرهەنگی"خاڵ خوازی "، بە لای کەمەوە لە زۆر دەڤەرەی کوردستان فەوتاوە یا کز بوە ، مەگەر پاڵەوانەکان ، کە جار جار هێشتا لەسەر باسک و پشت و شتیان ، وەک دروشمی پاڵەوانی خاڵ بکوتن .

پێویستە ئەمەش روون بکەمەوە ، کە خاڵ هەر بۆ ئافرەت بە خشڵی سروشتی جوانی لە قەڵەم دەدرا و ئافرەتی واش بو ، ئەگەر خاڵی سروشتی نەبو ، خاڵی شینی بۆ جوانی دەکوتا ، کە ئێستا زوربەی ئەوانە ، چون بە تایبەت لە شارەکان ، فەرهەنگی خاڵ جوانی زۆر کەمرەنگ بوە ، ئەو خاڵانە بە نەشتەرگەری دەسڕنەوە . لە لایەکی دیکەشەوە ، بۆ رازاندنەوەی بووک، بەشداری لە شایی و سەیران و شتی وا دا ، ئافرەتی واش هەیە ، خاڵی کاتی لە سەر دەموچاوی ساز دەکا ، بەڵام پاش رێوڕەسمەکە ، دەیسڕێتەوە .

لە زمانی کوردی دا ، وشەی خاڵ ، مانای دیکەشی زۆر هەیە ، کە لەو هۆنراوەی سەرەوەدا ئاماژەم پێکردوە ، بۆ وێنە بە برای دایکیش دەڵێن خاڵ . زانای مەزنی کوردیش ، بە شێخ محەممەدی خاڵ ناسراوە . یا تۆپەیکەی خاڵە ( وەستا)رەجەب لە شاری رەواندووز . یا ژینەوەرێکی زۆر سەحەسووک هەیە ، کە خاڵی زۆر پێوەیە ، پێی دەڵێن " خاڵخاڵۆکە " و ئەم ئەفسانە یە شی لە پشتە : لێ دەپرسن " خاڵخالۆکە ! ماڵی خاڵم لە کۆێوەیە ؟ . کە پێیان وایە بەروە ماڵی خاڵیان بەرێدەکەوێ !!! ؟؟؟ ، یا ئەگەر کەسێک زۆر لە خاڵی بچێ ، پێی دەڵێن " خاڵەوەڵەد " . یا خاڵو واڵ داکەوتنی کوێستان ، پاش دوایی هاتنی زستان و هتد .

## راڤەی " دا " ، لە زمانی کوردی دا

لە زمانی کوردی دا ، زۆر خاڵی وا هەیە ، کە یا بە چەشنێکی وا نایەتە بەر چاو یا ئەگەر بێتیش ، بە رواڵەت پێمان زۆر چکۆلە دەنوێنێ ، کەچی ، کاتێک راڤە و شرۆڤەی دەکەین ، دەبینین کۆلێک ئەرکی زماسازیان بەسەر شانەوەیە . بۆ وێنە یەکێک لەو خاڵانە پێشگری " دا " یە ، کە بە چەشنی دەفر و حاجەت ( ظرف) ی کات و جێگەش ، کەڵکی لێ وەردەگیررێ:

-کاتێک بە چەشنی پێشگر کەڵکی لێ وەردەگیردرێ ، زۆرتر مانای وشەی down ێ زمانی ئینگلیسی دەدا ، وەک " دا+بەزاندن " ، کە لە زمانی ئینگلیسی دا ، پێی دەڵێن downloadingدەتوانین بڵێین ، پێشگری " دا " ، بە پێچەوانەی ، پێشگری " هەڵ " ی زمانی کوردی ، کە بە مانای "بۆ سەرەوە" یە ، ئەم بە مانای " بۆ خوارەوە" یە و زۆرتر بە پێش کردارەکانەوە دەنووسێ ، بۆ وێنە وەک مشتێک لە گشتێک :

١- " دا " ، وەک پێشگر :

دا بەزاندن .
دا بەزین .
دا بوون ( کوور کردنەوەی پشت .
دا برین.
دا پەڕین .
دا پلۆسین .
دا چوون .
دا دوورین .
دا دڕین .
دا رزاندن .
دا رزین .
دا سەپاندن .
دا شکان .
دا شکاندن .
دا کردن . ( هەڵ رژاندن ) .
دا کردن . ( کردنە ژوورەوەی ئاژەڵ و شتی وا . )
دا کوتین .
دا گرتن .
دا گیران .
دا مردن

دا مرکاندن .
دا مەزراندن .
دا نەواندن .
دا نەوین .
دا وەراندن .
دا وەرین.
و رەنگە سەدان وشەی دیکە .

تێبینی : ئەگەر وشەیەک مانای زۆر روون نەبێ ، ماناکەیم نووسیوە. وشەی واش هەیە پتر لە مانایەکی هەس .

٢- " دا " ، وەک دەفر یا حاجەت ( ظرف ) ی کات و جێگە :

-وەک حاجەتی کات :

لە کات ژمێری حەوت دا.
لە ساڵی ١٣٠٠ دا .
لە رۆژی شەممە دا .
لە سەدەی بیست دا .

-وەک حاجەتی جێگە :
لەو شارەدا .
لەم بەستێنە دا .
لەم هەرێمە دا .
لە جیهان دا .

تێبینی : لە زاراوەی سلێمانی دا ، زۆر جار لە جێگەی " دا " ، " یا " بەکار دەبەن . بۆ وێنە لە باتی لەو شارەدا ، دەڵێن " لەو شارە یا " . دەبێ ئەمەش روون کەمەوە ، کە ئەو راڤە زمان ناسیانەی پێشکەشیان دەکەم ، زوربەیان لە سەر تەوەری زاراوەی سۆرانی زمانی کوردین ، دەنا زاراوە و بن زاراوەکانی دیکە ، راڤەی تایبەتیان گەرەکە .

## راڤەی پاشگری " وەند "

پاشگر ( پاشکۆ) ی " وەند " ، یەکێک لەو پاشگرانەیە کە لە زمانی کوردی ، بە تایبەت لە ئاخەفتنی دەڤەری باشورری ناوچەی رۆژهەلات و ناوچەی باشووری کوردستانی گەورەدا ، بە چەشنێکی بەربلاو بەکاردەهێنرێ . پاشگری " وەند " ، بە مانای خاوەن ، چاودیر و دروشمی بنەچەک و رەگەزە ، بۆ وێنە : دەماوەند = خاوەن دەم و هەلم ؛ کاکاوەند = لە هۆزی کاکا یا کاکە ؛ غیاسوەند = لە هۆزی غیاس ؛ ئەحمەد وەند = لە هۆزی ئەحمەد ؛ ئاخ وەند = خاوەن ئاخ و پەژارە و خەمخۆری بۆ کارەساتی کەربەلا ؛ ئەلوەند = هەلوەند = خاوەن شاخ و داخ و بەرزی ( لە هەلەمووت و"هەل"ەوە دێ) ؛ حەقوەند = لە هۆزی حەق و هتد .

لە زمانی کوردی دا ، جاری وا هەیە ئەگەر مانای چاودێری ببێ ، دەبێتە " وان " و لە زمانی فارسی دا بە چەشنی " بان "، بەکار دەبرێ ،بۆ وێنە: باغەوان =باغبان ؛ سارەوان =ساربان ؛ پشتیوان =پشتیبان و هتد .

لە زمانی فارسی دا ، زۆر جاریش لە جێگەی پاشگری " وەند " ، پاشگری " یان " بەکاردێ ، بۆ وێنە :" کاکاییان" ؛ غیاثیان " ؛ " احمدیان " و هتد .

هێندێک جار ئەگەر لە زمانی فارسی دا مانای خاوەن بدا ، دەبێتە " مند " ، بۆ وێنە " نیرومند " ؛ "زورمند" ؛ ثروتمند " و هتد .

لە زمانی ئەرمەنیش دا ، دەبێتە "یان " ، وەک "خاچاتووریان " ؛ " مانووکیان " ؛ " مارکاریان " و هتد . کە بەم پێیە " عیساوەند " ی کوردی لە زمانی ئەرمەنی دا دەبێتە " عیساییان . "

## راڤەی وشەی " شیرین "

کاتێک باسی زمانە وانی دێتە پێش ، زانستی ریشەی وشە ناسی ، یەکێک لە کۆلەکە سەرەکیەکانی ، ئەم بەستێنەیە . وشە ناسی ( فقه اللغه ) ،بۆ پەیدا کردنی مانای وشە زۆر بەکەلکە و دەتوانم بلێم ، وەک فۆرموولە ، لە زانستی شیمی دا.

ئێستا بۆ ئەوەی وێنەیەکتان پێشکەش بکەم ، وشەی " شیرین " راڤە دەکەین:

شیرین ، لە ریشەی "شیر" ەوە دێ و لە دو بەش پێک هاتوە ) شیر + ین= شیرین) . هەروەک دەزانین ، یەکێک لەو شتە سەرەکیە سروشتیانەی مرۆڤ خواردویەتیەوە شیری دایک بوە ، کە تەنانەت لە ئایین دا دەڵێن ، لە ئاوی کەوسەر شیرن تر و لە تەرزە سارد ترە . لە لایەکی دیکەشەوە ، بە پێی زانستی شیمی بەشێکی بەرچاو لە شیر ، شیرینیە . جا بەم پێیە ، "شیرین "واتە شتێک کە وەک" شیر"ە و تامی شیر دەدا و لە وشەی " شیر" ەوە رەگاژۆی کردوە.

هەر لەم ریشەیە ، زۆر وشەی دیکەش ساز کراوە ، وەک :

ناشیرین ، شیرینی ، شیرینی فرۆشی و هتد . لە کوردی دا ، شیرین ، ناوی کچیشە ، کە بە مانای رەزا شیرین ، پێکەوتو ، لەبەردڵ و جوانچاکە . رەنگە بە ناوبانگترین کچە شیرین ناوی مێژوی کورد ، شیرینی فەرهادی کۆکەن و شیرینی ماموەستا وەفایی بن ،کە سەبارەت بە مانە ، کتێب و هۆنراوەی بە ناوبانگی کوردی هەیە .

گۆرانی زۆریشمان هەیە ، کە بە وشەی شیرین دەستی پێ دەکەن ، وەک : شیرین بەهەرە ، شیرین داد مەچۆ ، شیرینێ خانم ، شیرین تەشی دەرێسێ ( هۆنراوەکەی ماموەستا وافایی ) ، شیرین شیرینە ، شیرین گیان و هتد .

پاشکۆ : بە هیوام فەرهەنگنووسانی کورد ، لەمەودوا بە چەشنی شێلگیرتر، لە زانستی ریشەی وشە ناسی کەڵک وەربگرن و تا دەکرێ ، لە شرۆڤەی هەر وشەیەک دا ، ریشەی وشە ناسیەکەشی بنووسن .

## "رێزم هەیە " ، سەرەتایەک بۆ " بێ رێزی "

زۆر جار لە نووسراوە کوردیەکان دا ، دەبینین کاتێک نووسەرێک گەرەکیەتی (دەیەوێ ) هەڵ سەنگاندنێکی نەرێی ( رەخنەیەک ) ، ئاراستەی کەسیکی دیکە بکا ، بوە بە باو ، بە لەتەرستە (عیبارەت) ی " رێزم هەیە بۆ فیسارەکەس " یا " لەتەک ( لەگەڵ ) رێزم دا بۆ فیسارە کەس " ، نووسراوەکە دەست پێ دەکا . هەمو دەزانین کە رێزگرتن لە خەڵک زۆر کردەوەیەکی شازە و وشەی رێز ، بۆ خۆی وشەیەکی یەکجا زۆر پیرۆزە ، هەر کەس رێز لەخەڵک بگرێ دروشمی خاوەن رێزی و ماقووڵی خۆیەتی . بەڵام نەک رێز گرتنێکی کلیشەیی، سەرپۆرت و سەر زارەکی ( نێو بەتاڵ ) ، کە ببێتە پێشەکیەک بۆ بێ رێزی و کەڕڕە و کوڕە هەڵ دان لە خەڵک ، نەک قسەیەک بێ بۆش، وەک هێندێک لە دووکاندارەکان ، کە کاتێک دەچی شتێک بکڕێ ، چەند جار دەڵێن " تۆغا لێی گەڕێ !" ، واتە پارە مەدە ، کەچی هەر لەو کاتەدا ، دوبەرابەر بە سەر بایی شتەکەدا دەکێشن ، بە گرانتر پێت دەدەن و ئەگەر دو قران کەمتریان پێ بدەی ، دەنگت دەدەن !!! . کەس نیە بێژێ میرم " نە بڵێ تۆغا لێی گەرێ و نە شتەکە هێندە گران بفرۆشە . "

جا با بێمەوە سەر بستێی تەوەرەی باسەکە : رووناکە کە هەڵ سەنگاندن ، راڤە و شرۆڤەکردنی بابەت زۆر کارێکی پێوستە . بەڵام نەک هەوەڵ بە وشەی "بەرێزەوە و فلان و فیسار "، دەستی پێ بکەین و لە هەمان کات دا ، بە رەستە و وشەگەلی سەدەکانی نێوەراست رەخنە کە بگرین و شرت شۆ لەو کەسە قوربەسەرە بسەنین . دەتوانین مەبەستە کەی خۆمان بگەیێنین ، ئەگەر ئامۆژگاریەکی باش و بەجێمان هەیە دەری ببڕین و رێنوێنی بکەین ، بەڵام بە رستەگەلی زانستی ، شیاو ، جوان و پێکەوتو ، نەک بۆ پاک کردنەوەی کۆنە قین و خودای نەخواستە تاقم بازی و شتی وا .

لە لایەکی دیکەشەوە ، ئەو کەسەی کە رەخنەی دڵسۆزانەی بۆ ئاراستە دەکرێ ، هەر نەڵێ "مریشکی من یەک پێی هەیە " ، دڵی بێشێ و بە بێ رێزی بەرەو پیری رەخنەکە بچێ ، بەڵکە سپاسی ئەو کەسە بکا کە رێنوێنی بەکەڵکی کردوە و بوەتە هۆی ئەوە کە لە داهاتو دا ، بابەتەکانی باشتر بنوسێ یا کارە هونەریەکانی ، خاستر پێشکەش بکا .

تێبینی : ئەم نووسراوەیە مەبەستێکی گشتیە ، سێرەی لە کەس نیە و بە هیوام ببێتە هۆی ئەوی کە رەخنەکانمان ببنە هەڵ سەنگاندنی لایەنی باش و ناباشی بابەتەکان و کارە هۆنەریەکان و دڵفراوانی مرۆڤگەلێک کە کارەکەیان بە چەشنی دڵسۆزانە هەڵ دەسەنگێنرێ .

تێبینی : بۆیە هێندێک وشەم لە زاراوەکانی دیکەی کوردی خستوەتە نێو ئەم نووسراوەیە ، کە بۆ پیتاندنی زمانی کوردی ئەم کارە بە پێویست دەزانم و لە لایەکی دیکەشەوە زۆر وشەی زاراوە گەلی دیکە هەیە ، لە هی سۆرانی شیاو ترن ، بۆ وێنە وشەی " لەتەک"

زاراوەی گۆرانی کە زۆر جوانترە لە وشەی " لەگەڵ" ی زاراوەی سۆرانی ، کـە مانـای نەرێییشی  هەیە .

## زانستی "گۆڕانکاری وشە " لە خزمەت زمانی کوردی دا

دوای ئەوەی راڤەیەکم سەبارەت بـە زانسـتی "ریشـەی وشـە ناسـی "پێشکەش کـرد ، لـەم نووسراوەیەدا ، دەمەوێ سەبارەت بە زانستی " گۆڕانکاری وشە " یا   Morphology وشە بدوێم :

بۆ ئـەنجام دانـی ئـەم شرۆڤەیە ، وەک وێنـەیـەک ، باسـی یاسـای گۆڕانکـاری ئـەو وشـانە دەکـەم ، کـە لـە زمـانی کوردیـەوە ، چوونـەتـە نێو زمـانی  فارسـی                    ( روونکردنـەوە : بۆیـە نـاڵێم لـە زمـانی فارسیەوە  هاتوونـەتـە نێو زمـانی کـوردی ، چـون زمانی کوردی بە زمانێکی بوورەتر(بیکر) تر و کۆن تر دەزانرێ : (

-گۆڕانی پیتی "و" ، بە پیتتی  "ب : "

زۆر جار پیتی " و" لە زمانی کوردی دا ، کاتێک دەچێتە نێو  زمانی فارسی ، دەگۆرڕێ و دەبـێ بـە " ب" ، وەک : شـەو = شـەب ؛ لێو = لـەب ؛ خـەو  =  خـاب ؛ سێو =سیب ؛

باوک = بابەک و هتد

-گۆڕانی پیتی "و " ،بە پیتی "م : "

زۆر جار پیتی "و " لە زمانی کوردی دا ، کاتێک دەچێتە نێو زمانی فارسی ، دەگۆڕرێ و دەبێ بە " م " ، وەک : داو = دام ؛ خاو = خام ؛ کاو = کام ؛ ناو=نام؛ راو کردن = رام کەردەن و هتد .

-گۆڕانی پیتی "ۆ" بە پیتی " وو : "

هەمیشە پیتی " ۆ" لە زمانی کوردی دا ، کاتێک دەچێتە نیو زمانی فارسی ، دەگۆڕرێ و دەبێ بە " و " ، وەک: بۆران = بووران ؛ بۆر = بوور ؛ جۆر = جوور ؛ بۆران = بووران ؛ گۆران = گووران و هتد .

-گۆڕانی پیتی " و " بە پیتی " ڤ : "

زۆرجار پیتی " و" ، لە زمانی کوردی دا ، کاتێک دەچێتە نێو زمانی فارسی دەگۆڕرێ و دەبێ بە " ڤ " ، وەک : دەماوەند = دەماڤەند ؛ ئەڵوەند = ئەلڤەند ؛ پاوە = پاڤە ؛ مەریوان = مەریڤان و هتد ) . روونکردنەوە : لە زمانی فارسی دا پیتێک بە شكڵی " ڤ" نیە ، بەڵام دەربڕینەکەی وەک " ڤ" یە . (

-گۆڕانی پیتی " ح " بە پیتی " ه : "

زۆر جار پیتی "ح " لە زمانی کوردی دا ، کاتێک دەچێتە نێو زمانی فارسی، دەگۆڕری و دەبێ بە " ه" ، وەک : حەوت = هەفت ؛ حەڤدە = هیفدە و هتد .

-زۆر جار پیتی " ێ " ، لە زمانی کوردی دا کاتێک دەچێتە نێو زمانی فارسی، دەگۆڕرێ و دەبێ بە " ی " ، وەک : تەورێز = تەبریز ؛ سێزدە = سیزدە ؛ سێو = سیب ؛ شێر (شێری جەنگەڵ) = شیر و هتد .

-هەمیشەش پیتتی "ح" و " ع" ی عارەبی کە هاتوونە نێو زمانی کوردی ، لە زمانی فارسی دا وەک " ه " و " ا : ئە = ئا = ئێ " ... ، دەردەبڕرێن ،بەڵام هەر بەچەشنی عارەبی دەنووسرێن ، وەک : حاشا = هاشا ، حەز = هەز ؛ حەرارەت = هەرارەت . یا : عەلی = ئەلی ؛ ئەحمەد = ئەهمەد ، حوسەین = هوسەین و هتد . ( رۆونکردنەوە : لە زۆر لە زاراوە کوردیەکاندا ، پیتگەلی "ح " و "ع" ، هەر وەک فارسی دەردەبڕرێن ، وەک زاراوەی گۆرانی و هتد .

زۆر روانگەی دیکەش هەیە ، کە پێویستان بە نووسینی کتێبگەلێک زلەیە ، بەڵام من لێرەدا ، وەک مشتێک لە گشتێک ، ئەم کورتە راڤەیەم پێشکەش کرد .

## شازی و پاراوی زمانی کوردی

سەرەڕای ئەوەی کە نەیاران هەوڵی هەمە لایەنەیان بۆ کز کردن ، پاکتاو و تەنانەت فەوتاندنی زمانی کوردی داوە و لە زۆر جێگە ، نە هەر لە قوتابخانە و بە فەرمی ئەم زمانە نەخوێندراوە ، بەڵکە قسە کردنیش بە کوردی ، بە سووچ و تاوان دانراوە و ئێستاش لە هێندێک دەڤەر هەر وایە ، بەڵام لە تەک ئەمەش دا ، ئەم زمانە تایبەتمەندی خۆی هەر پاراستوە و یا با بڵێم لە زۆر سۆرغەوە بە زمانێکی بە پیت و شازی جیهانی دادەنرێ .

بۆ سەلماندنی ئەم بیرۆکەیە ، لە خوارەوە وشەیەک هەڵ دەبژێرین ، کە لە زمانی فارسی دا ، هەر دەتوانرێ بە دو پیتی " گ " و "ل " ، واتە " گل " بنووسرێ و لە خوێندنەوەی دا دڵەراوکێ و کێشە پەیدا دەبێ ، بەڵام لە زمانی کوردی دا ، وشەکە بۆ هەر مانایەک ، بە چەشنێکی تایبەت دەنووسرێ و هیچ کێشەیەکی مانا لێکدانەوەی نیە :

**گەل ، لە فارسی دا "گل" دەنووسرێ، یانی (میللەت ).**
**گوڵ، لە فاسی دا ،هەر "گل" دەنووسرێ، یانی (گوڵی باغ ) .**
**گێل ،" " " گل" " ، یانی(کاس).**
**گۆڵ ،" " " گل" " ، یانی (سەگی نێ ) .**
**گۆل ،" " " گل" " ، یانی (ئەستێر.)**
**گل ، " " " گل" " ، یانی (ژان ) .**
**گەڵ، " " " گل" " ، یانی ( عەورەت) .**
**گڵ ، " " "گل" " ، یانی ( خۆڵ ) .**
**و ...**

ئەو راڤەیەی سەرەوە مشتێکی چکۆلەیە ، لە گشتێکی زلە و دروشمی شازی و پاراوی زمانی کوردیە ، کە بە نووسینی وشەکان بە زمانی کوردی ، پێویست بەوە نیە لە مانا لێک دانەوەیان دا ، خوێنەر سەر لێشیواوی بۆ بێتە پێشەوە، کە ئەم تایبەتمەندیەش پتر لە سێبەری رێنووسی نوێی کوردی ، دانانی دروشمی (v) و نووسینی دەنگەکان بە پیت، وەدەست کەوتوە .

تێبینی: من لێرەدا زمانی فارسیم وەک کەرەسەی هەڵ سەنگاندن بەکار بردوە ، نەک بە مەبەستی شێڤێنیستی و زمانی خەڵک بە سووک زانین ، دەنا لە روانگەی منەوە ، هەمو زمانێک جێگەی رێزە ، کە یەکێک لەوانە زمانی فارسی ئامۆزامانە ، کە بە نزیکترین زمان ، لە زمانی کوردی دا دەنرێ .

## راڤەی وشەی " کەڵوڕ "

لێرە دا ، راڤەیەکتان سەبارەت بە وشەی "کەڵوڕ" پێشکەش دەکەم . بەڵام بەر لە هەمو شت ئاماژە بەمە دەکەم ، کە " کەڵوڕ " یەکێک لە هەرە رەسەنترین ئەندامی نەتەوەی کوردن و زوربەیان لە پارێزگە گەلی کرماشان و ئیلام دەژین . بەڵام پارێزگەی لوڕستان ، دەڤەری خانەقین و مەندەلی ، گشت ناوچەی گەرمیان و زۆر جێگەی دیکەش هۆزی بەرێز و رەسەنی کەڵوڕی لێ هەیە . زۆریشیان لە درێژایی مێژودا ، بە زۆرەملێ گوێزراونەتەوە بۆ ناوچەی هەوشار ، سەقز، دەور و پشتی قەزوێن و تاران و ئەوانە . لە شاری بۆکانیش گەڕەکێک هەیە ، بە ناوی " کەڵوڕاوا " ، کە لە کەڵوڕە کۆچێندراوەکانی ناوچەی هەوشار پێک هاتوە و لە مێژودا پێیان دەڵێن " کەڵوڕی دێرامەدی " و لە گوندەکانیانەوە هاتوونەتە بۆکان .

ئاخەفتنی کەڵوڕی ، گەورەترین بن زاراوەی زاراوەی گۆرانیە . وشەی " کەڵوڕ " لە دو بەش پێک هاتوە( کەڵ+لوڕ ) ، کە بە واتەی لوڕی گەورە یە . ئەم بیرۆکەیە بۆ سەلماندنی ئەوەی کە" لوڕ"یش هەر کوردە و لەگەڵ کورد تێکەڵە ، زۆر ئامرازێکی زمان ناسی راست و بە کەڵکە . هەم لوڕی گەورە هەیە و هەم لوڕی چکۆلە . هەر وەک وتم کەڵ+ لوڕ = کەڵوڕ، واتە لوڕی گەورە ، چون لە زمانی کوردی دا ، وشەی " کەڵ " واتە گەورە و مەزن .

زوربەی کەڵوڕەکان شیعەن ، بەڵام زۆریشیان کاکەیی ( یارسان ( نن ، کە ئایینێکی زۆر کۆن ، پیرۆز و رەسەنی کوردیە . بەڵام کەڵوڕگەلی دەڤەری بۆکان و سەقز ، سوننی شافیعین . پێویستە ئەمەش وەبیر بخەمەوە ، کە کورد هەر ئایینێکی ببێ ، هەر کوردە ، خۆی بە کورد دەزانێ و رێز بۆ ئایینی دیکە رادەگرێ .

کاتێک لە زمانی کوردی دەڕوانین ، زۆر لە شتە کۆنەکان بەر لە زاراوەی کرمانجی و سۆرانی، بە زاراوەی گۆرانی نووسراون ، کە کەڵوڕی یەکێک لە لقە سەرکەیەکانی ئەو زاراوەیە ، وەک شانامەی کوردی ، کتێبە ئایینیەکانی کاکەیی ( یارسان ) ، کتێبە چیرۆکە کوردیە کۆنەکان ، وەک " زەردە هەنگ " ؛ شێرین و فەرهاد و هتد . ماموەستا عەلائەددین سەججا دیش، لە کتێبی بە ناو بانگی مێژوی ئەدەی کورد دا ، رەنگە ئاماژەی بە دەیان هۆنەری هەڵکەوتوی کەڵوڕ کردبێ .

من لە سەفەرێکی یەک مانگە دا ، کە بۆ ناوچەی کەڵوڕی کرماشان و ئیلام ئەنجامم دا ، بۆم دەرکەوت کە کوردگەلی کەڵوڕ ، لە روانگەی نیشتمان پەروەری ، پاکی ، کوردبوون ، جوامێری و مێرخاسیەوە ، دەکرێ بە دروشمی کوردیان ناو بەرین . تەنانەت لە روانگەی سیپاڵ و جلو بەرگیشەوە ، کاتێک دەچیتە بازاڕی کرماشان ، بە دەیان چەشن سیپاڵی رەسەنی کوردی دەبینی ، کە لە کەم شاری کوردەواری دیومە . دەتوانین کرماشان بە مەکۆ و نێوەندی سەرەکی کەڵوڕەکان بزانین ، کە ئەمە جێگەی شانازیە .

هێندێکی زۆر زۆر کەمیش لە دانیشتوانی شاری کرماشان ، کە شارێکی تڕانزیتی ئاییینیە ، بە دوای کار و کاسبی هۆتێل داری و شتی وا دا ، لە شارگەلی عەجەمستانەوە هاتوون ، کە ئەوانە بە ڕەگەز کورد نین و مافی خۆیانە فەرهەنگی عەجەمیان ببێ- هەر وەک ئێمە لە تاران فەرهەنگی کوردیمان هەیە - ، ئەوانەش بە پیی دابی میوانخۆشەویستی کوردی ، زۆریان ڕێز لێ دەگیررێ و تۆفیریان ناخەن .

لە ڕوانگەی ننێوەند و مەکۆی نەتەوەییشەوە ، پێم وایە هەر کات کوردستانێکی گەورە ساز ببێ ( کە مافی کوردە ) ، شیاو ترین جێگە بۆ پێتەخت ، شاری کرماشانە ، کە نزیکەی چوار سەد ساڵ پێتەختی ساسانی گەلیش بوە و لە ڕوانگەی گرنگی و جیهانی بوونی شوێنەواری مێژویشەوە، لە ناوچەی کوردەواری دا ئەگەر نەڵێم بێ وێنەیە ، کەم وێنەیە .

ڕەگەزی کەڵوڕ ، یەکێک لە ڕەگەزە پیرۆزە کانی گەلی کوردە ، کە نابێ بە هیچ کلۆجێک و لە ژێر گوشاری هیچ ستەمێک دا ، لێی دوور بکەوینە و بهێڵین لێمان دوور بکەوێتەوە :

هۆنراوەی فۆلکلۆری :

**ڕِ ئاو و شاهۆ هەردوی برا بین وە دەست جەور، لە یەک جودا بین**

(ڕِ ئاو ناوی کێوێکە لە پشت کرماشان )

گۆرانی مامۆستا حەسەن زیرەک :

**کرماشان شاری شیرینم شاری گەورەی کورد نشینم .**

هۆنراوەی نووسەری ئەم بابەتە :

دەچمە بانی عەرزی تەرزی شاخی سەربەرزی "تەتە"،
سەیری هەورامانی تەخت و سەحنە و هەرسین ئەکەم .
کوردی کرماشان و ئیلام ، قەلبی کوردستانمن ،
من بە پێناسەی لەک و لوڕ ، هەست بە خۆ ناسین ئەکەم .

# کێ دەڵێ زاراوەی هەورامی کوردی نیە !؟

جار جار ، تاقل و تۆقل، هێندێکی زۆر کەم دەیانەوێ بێژن زاراوەی هەورامی زمانی کوردی نیە و بۆ خۆی زمانێکی سەربەخۆیە . من لەبەر ئەوەی کە پێم وایە دەبێ وەڵامی ئەو بەرێزانە بە چەشنی زانستی بدرێتەوە ، نەک بە شەڕە دەندووکێ . جا ئەگەر خودای نەخواستە ئێستاش هەر ئەوە دەڵێن و لەسەری سوورن ، لێرەدا چەند بەڵگەی سەرەکیان پێشکەش دەکەم ، تا بە بەڵگە پێیان بسەلمێ هەورامی یەکێک لە زاراوە سەرەکیەکانی زمانی کوردیە و بە جارێ ئەو بیرۆکەیە لە مێشکیان دا ،بشۆررێتەوە . چون دڵنیام ئەو چەشنە بۆچوونە نازانستیانە ، وەک لەت بوونی لایەنە رامیاریەکان ، بە سوودی دۆزی کورد نیە :

-1یەکێک لە نووسراوە هەرە کۆنەکانی هەورامی ، کە کەوتوەتە بەر دەست من ، کتێبی " ماریفەتی پیر شالیار" ە ، کە بریەتە لە نووسراوەکانی ، پەیامهێنەر و بیرمەندی مەزنی کورد ، سەروەر پیرشالیاری هەورامی ، کە گڵکۆکەی لە هەورامانی تەختە . کاتێک کە بۆ وێنە کوردێکی سۆرانی یا گۆرانی و هتد دەیخوێنێتەوە ، لە زوربەی زۆری تێ دەگا و بە زمانێکی بیانی نازانێ . بەڵام بۆ وێنە ، کابرایەکی ئینگلیسی خەڵکی لەندەن، بە دەگمەن تێ دەگا ، کە " جێفری چاوسێر " هۆنەری ئینگلیسی زمانی سەردەمی زۆر کۆن چی دەڵێ . چون لە درێژایی مێژودا ، زمان گۆڕانی بەسەردا دێ .

-2ماموەستا عەلائەددین سەججادی ، لە کتێبی بە ناوبانگی مێژوی ئەدەبی کورد دا ، بە دەیان و بگرە زیاتر ، هۆنەری هەورامی سەردەمی کۆن و نوێ دەناسێنێ . کە تەواوی کورد باش لە هۆنراوەکانیان دەگەن .

-3زوربەی پەڕتووکە ئایینیەکانی کوردگەلی کاکەیی ( یارسان (، بە هەورامی یا زاراوەی گۆرانین و کەس ناڵێ تێی ناگەم . بەڵام بۆ وێنە تورکە کاکەیی ( یارسان) ە کان ، کە لە شاری روودەهن و بوومهەنی دەڤەری تاران دەبێ بۆیان وەربگێڕی ، وەک زوربەی موسوڵمان کە لە کتێبی ئاینی عارەبی تێ ناگەن .

-4بە گشتی سیپاڵی خەڵکی هەورامان ، بۆ وێنە لەگەڵ سیپاڵی خەڵکی کوردی گوندەکانی سەردەشت و ... تۆفیرێکی فرە کەمی هەیە .

-5گۆرانی و هەڵپەڕکێی خەڵکی هەورامان ، بۆ وێنە لە گەڵ دەڤەری شاری سەقز هەر ئەوەندەی تۆفیر هەیە ، کە خەڵکی سەقز لەگەڵ هی شاری ئامەد .

-6لە روانگەی کۆمەڵناسی ، خو و خدە و دەروونناسیەوە ، بۆ وێنە تۆ فیرێکی بەرچاو لە نێوان خەڵکی ئیلام و هەورامان دا نابینی ، مەگەر ئایین .

-7قەد نەمدیوە کوردێکی ناوچەکانی دیکەی کوردەواری ، لە کوردێکی هەورامی تێ نەگا . کەچی بۆ وێنە لە ئینگلیس خەڵکی پارێزگەی سکاتلەند ، زۆریان ئەوتۆ لە زمانی ئینگلیسی لەنەن تێ ناگەن .

-8زۆر خاڵی وشەناسی ، رێزمان ، تەشکناسی و کەرەسەی زمان ناسی دیکەش هەیە ، کە پچووکترین دڵەڕاوکێ لەوەدا ناهێڵن ، بڵێین هەورامی کوردیە ، بەڵام ئەو گشتە حەیسە و بەیسە زۆرە ،لەم نووسراویەدا جێگەی نابێتەوە .

-9رەنگە ئەو خۆشەویستانە ، کە پێموایە لە قامکانی دەستیش کەمترین ، ئەم شتە لە زمانی هێندێک رۆژ هەڵات ناسی کوردی نەزانەوە بڵێین یا لەبەر ئەوەی ، بۆ وێنە لە پاوە بە کوردی نا هەورامی دەڵێن جاف و بەوان دەڵێن هەورامی . کە ئەمە لە بنەڕەت دا هەڵەیە ، هۆزی رێزداری جاف ، هۆزێکی مەزنی کوردن ، نەک گەلی کورد . بۆ وێنە من هەورامی نیم و جافیش نیم ، بەڵام کوردم .

-10بە کورتی شتەکە لە رۆژ روون ترە و هەوڵ دانی پتر بۆ سەلماندنی ئەم راستیە ، کە زاراوەی هەورامی یەکێک لە زاراوەکانی کوردیە ، وەک ئەوە وایە لە نیوەڕۆی تاو و ساوی مانگی گەلاوێژ دا ، رۆژ لە ئاسمان دا بە خەڵک نیشان بدەی .

## راڤەی وشەی " گەورەک "

هۆزی گەورک ، یەکێکن لە هۆزە هەرە رەسەنە کانی نەتەوی کورد ، کە دەکرێ بە چەشنی گشتی بڵێین لە دەروبەری شارگەلی مەهاباد ، سەردەشت ، سەقز ، بۆکان دەژین و هێندێکیشیان لە باشووری کوردستانن . رەنگە تاقل و تۆقل لە بەشەکانی دیکەی کوردستانی گەورەش ببن ؟ ژینگەی ئەم هۆزە بەرێزە ناوی " گەورکان" ە .

خەڵکی لاوەکی زۆر تر ئەم وشەیە وەک " گەورک " دەردەبڕن ، بەڵام خۆدی گەورکەکان بۆ خۆیان زۆر جار دەڵێن " گەور' ک" یانی نێوبڕی دەدەنێ .سەبارەت بە وشەی "گەورک " ، دەچمە سە وتەی زانایەکی کۆمەڵناسی زەردەشتی هیندوستانی ، کە لەوێنە جار جار پێشیان دەڵێن " پارسا = پارسی . " ئەم زانا کۆمەڵناسە زەردەشتیە ، نووسراوەیەکی ناردبو بۆ کۆنگەرەی نێو نەتەوەیی زەردەشتیانی جیهان لە تاران ، کە

بە هەڵکەوت من وەرگێڕی وتارو و نووسراوە نێرراوەکان بۆ ئەم کۆنگەرەیە لە زمانگەلی بیانیەوە بووم . بە داخەوە ناوی ئەو رێزدارەم لە بیر نەماوە، بەڵام لە بەشێک لە وتارە ئینگلیسیەکەیدا نووسیبوی : " لە کاتی هێرشی عارەب دا، گەلی کوردیش زوربەیان زەردەشتی و زۆریش هۆگری ئەم ئایینە بوون . بۆ وێنە هۆزێکی کورد ، بە ناوی" گەورک "، کە بە مانای (گەورە چکۆلە ، گاورە چکۆلە ، زەردەشتیە ) یە ، بۆ پاراستنی ئایینەکەیان پەنایان برد بە کوێستانەکانی کوردستان و هەتا ماوەیەکی زۆر هەر وەک زەردەشتی مانەوە ، بەڵام ئێستا لە مێژە ئەوانیش هاتوونەتە سەر ئایینی ئیسلام. وتارەکانی ئەم کۆنگەرەیە ، لە پەڕتووکێک دا چاپ کران ، کە لە پەڕتووکفرۆشی زەردەشتیە کان لە تاران ، لە شەقامی کاخی پێشو دەفرۆشرا .

قسە قسە دەهێنێ : ئەم هۆزە رەسەنە بەرێزە کوردە ، شانازی ئەوەشیان هەیە کە دو نەفەر لە شەهیدانی هاورێ و هاوکاری نەمر پێشەوا قازی محەممەد لەو بنە ماڵەیە بوون : "عەلی ئاغا " و " رەسووڵ ئاغا ."

ئەم هۆزە ئافەرەتگەل و پیاوگەلی زۆر شیاوی دیکەشیان لێ هەڵکەوتوە ، کە جێگەی شانازی کوردن و بۆ نووسینی ناوی هەموویان ، پێویست بە کتێبێکی مەزن و تایبەتە .

مەبەستێکی دیکە ، کە جێی سەرنجە ئەمەیە : ناوی ئاواییەکانی زۆر نزیکی بۆکان و مەهاباد زۆریان تورکین ، بەڵام هەتا بەرەوژوور دەبیتەوە و زۆر تر دەچیتە نێو دەڤەری گەورکان ، ناوەکان زۆرتریان دەبن بە کوردی رەبەن ، وەک سیادەر ، ساردە کوێستان ، کوێرەکانی و ... . ئەم فۆلکلۆرەش زۆر زۆر جێی تێرامانە :

حەریرە و ئاگر بارانە ، کارخانەکەی لە "گوڵۆڵانە "؟ گوڵۆڵان یەکێک لە گوندەکانی گەورکانە .

## مانای وشەی گۆران

رەنگە زۆر کەس ئەم پرسیارەیان ببێ ، کە ئایا وشەی " گۆران "مانای چیە ؟ . هەر وەک دەزانین ، ئەم وشەیە لە زۆر بەستێن دا ، لە زمانی کوردی دا بە کار دەبرێ ، بۆ وێنە: (١) یەکێک لە زاراوە سەرەکیەکانی زمانی کوردی زاراوەی " گۆران) یە ؛ ( ٢) ناوچەیەکی یەکجار زۆر زلە یە لە باشووری کوردستانی گەورە ؛( ٣) بەو نەتەوە ناکوردانەی کە ئایینی بەرێزی کاکەیی ( یارسان ) ، لە کوردەواریەوە چووتە نێویان و بوون بە کاکەیی ، پێیان دەڵێن ( گۆران ) ، بۆ وێنە تورکەکانی روودهەنی دەڤەری تاران و شارگەلی ئازربایجانی ئێران ؛ (٤) یەکیك لە هۆزە گەورەکانی دەڤەری کرماشان ناوی ( گۆران) ە و لە زۆر جێگەی دیکەش ، تاقل و تۆقل گۆران هەیە ، وەک ناوچەی هەوشار لە رۆژهەڵات ؛ ( ٥) هۆنەری مەزنی هاوجەرچی کورد ماوەستا عەبدوڵلا بەگ ، ناسناوی ( گۆران) ی بۆ خۆی هەڵ بژاردوە ؛ (٦) لە زمانی کوردی دا وشەی ( گۆران) ی ، بە ستران و بەستەش دەڵێن و . ...

ئێستا با پەراوێزی راڤەکە ، بە تەبەنەی کیبۆرد دابکوژێنین و بێینە سەر کاکڵی مەبەستەکە ، کە بریەتیە لە راڤە کردنی مانای وشەی ( گۆران :

وشەی ( گۆران ) ، لە بنەڕەت دا ، وشەیەکی کۆن و رەسەنی زمانی کوردیە ، کە لە پێش دا (گەوران ) بوە ، یانی ( گاورگەل ) یا یا زەردەشتی گەل ، کە بە زاراوەی گۆرانی ( گووران) دەردەبڕرێت . بۆیە بە زاراوەی گۆرانی زمانی کوردی ، بە گۆران دەڵێن ( گووران) ، چون پیتی (ۆ) ی کلۆریان نیە بۆ وێنە دەشڵێن سووران ، بووران و هتد . وشە گەلی ( گەور یا گەبر ، یا گاور ) هەموویان لە زۆربەی زمانگلەی ئاریی دا ، بە مانای زەردەشتین . بۆ وێنە خۆمان پەندێکمان هەیە دەڵێ " گەوری سەرکێوان بە حاڵی ئەو نەبێ " ، کە هی کاتێک بوە گاورە خەباتگێڕە کوردەکان لە ترس ئەنفالی داگیرکەران و چەوسێنەران ، پەنایان بە کێو و شاخی کوردستان بردوە یا با بڵێین پێشمەرگەی ئەو کاتە بوون و لە ئەشکەوت ،کێو و بەندەنی وەک قەندیل ژیاون . یا لە زمانی فارسی دا، هۆنەری ناسراو سەعدی شیرازی ، لە پێشەکی کتێبی گولستان دا ، رو بە بە خودا دەڵێ : "ئەی کەریمێک کە لە خەز زێنەی غەیب دا رۆزی بە ( گەبر ) و تەرسا دەدەی ، تۆ کە چاوەدێری دوژمنانت دەکەی ، کەی دۆستانی خۆتت لە بیر دەچێ ؟؟؟!!!" . لێرەدا ، شێخی سەعدی مەبەستی لە وشەی دوژمنان ، یەکێکیان " گەبر یا گاورە " کە یانی زەردەشتی . دەڵێن قسە ،قسە دێنێ : کەس چاوەڕوانی قسەی وا کلۆر و نێو بەتاڵ و سەیری ، لە سەعدی نەدەکرد ، کە هۆنراوەی بە ناوبانگی " بەنی ئادەم" ی ، وەک دروشمی مرۆڤدۆستی ، لە سەر باڵەخانەی نەتەوە یەکگرتوەکان ، لە نیو یۆرک نووسراوە ". قوربان گیان ! هەرچۆن بێ ، بیلامانێ هێندێک هۆنەر وەک مریشک هێلکەش دەکەن و ... یش دەکەن !. یا لە جێگەیەکی دیکە دا ، دەڵێ "ئەگەر ئاوی بیری مەسیحی پیسە ، خەم مەخۆ چون جوولەکەی مردوی تێدا دەشۆی !!! یانی بە فەرمایشی سەعدی دەبێ ، ئەنشتاینی

جوولەکە پیس بێ ، بەڵام ئەبو قەرتاڵەی حەبەشی خاوێن !!! . رەنگە جێشی ببێ بڵێم ، سەعدی چەند ساد ساڵ پێش بە پێی فەرهەنگی وەپاشکەوتوی ئەو سەردەمە ، ئەم قسەیەی کردوە .

وشەی ( گەورک) یش کە ناوی هۆزێکی زۆر ماقووڵی کوردە و لە ناوچەی موکریان و رۆژهەڵاتی هەرێمی باشوور دەژین ، بە پێی ئەم بەڵگەیە ریشەکەی هەر لەوێوە دێ : کۆنفرانسی نێو نەتەوەیی زەردەشتیەکانی جیهان بو ، بابڵێم بە هۆی ئەوەی من دەمتوانی لە چەند زمانەوە بابەت وەرگێرم ، بێ ئەوەی بە چەشنی فەرمی زەردەشتی بم ، منیان وەک وەرگێری کۆنفرانسەکە دیاری کرد .بابەت زۆر دەهات : لە گۆشە و قوژبنی جیهانەوە بە زمانگەلی جۆر بە جۆر . رۆژێک بابەتیکیان دا بە من ،لە زمانی ئینگلیسی وەرم گێرا ، کە کابرایەکی موبید( رێبەری ئایینی) ی زەردەشتی لە هیندووستانەوە ناردبوی . لەم بابەتەدا ، ئاماژەی بەمە کردبو ، کە گەلی کورد یەکێک لەو گەلانە بوون ، زۆر پایان لەسەر ئەوە داگرتوە ، کە هەر لە سەر ئایینی زەردەشتی بمێننەوە و نووسیبوی : " هۆزێکی کورد هەیە بە ناوی ( گەورک ) ، کە بە مانای (گاوەرە چکۆلە) یە . ئەم هۆزە تا چەند ساد ساڵ پێش ، لە کوێستانەکانی ناوچەی کوردەواری یانی لە زێدی خۆیان ، کە زۆر عەستەم و شاخ و بەردە ، پەنایان گرتبو و هەر وەک زەردەشتی مابوونەوە ، بەڵام لە پاشان ئەوانیش لە ژێر زەخت و گوشاری جۆربەجۆر دا ، ئایینی زەردەشتیان لە دەست دا". ( تێبینی: رەنگە وەک شەنگاریان لێ کردبێتن .

با بێینەوە سەر بستێی تەوەرەی باسەکە ، کە بریەتی بو لە راڤەکردنی مانای وشەی ( گۆران) : بۆ وێنە لە بان ئەو پێستە ئاسکە مێژوییە بەناوبانگەش، کە زۆربەمان ناومان بیستوە ، لە رستەیەکی دا باسی پاکتاو کردنی "گەورە گەورەکان "، بە دەست عارەب دەکا . کە لێرەدا بە مانای سەر گەورەی گاورەکان یا سەرۆکی زەردەشتیەکان . وشەی ( گۆرانی ( یش ، بە مانای ئەوەیە کە بە داب و نەریتی زەردەشتیەکان یا گەوران ، لاژە ، ستران و بەند بچرن ، - وەک سروودی گاتاکانی زەردەشتی و سروودەکانی دیکەیان .

بە کورتی ئەگەر باسەکە کۆ بکەینەوە و سەرتان زۆر نەیەشێنم ، وشەی (گۆران ) واتە گەوران ، گەبران ، گاوران یا زەردەشتیگەل . زاراەی گۆرانی و ئەوانەی بەم زاراوەیە قسە دەکەن ، زۆر کوردێکی ماقووڵ و رەسەنن و رەنگە بتوانم بڵێم بە حەشیمەت لە سۆرانیش پترن. وشەی گەورەش هەر لەو ریشەوە رەگاژۆی کردوە

دوانووس :( PS ) لە هێندێک ناوچەی کوردەواری ، وشەی) گۆران) ، ( کرمانج ) و ( مسکێن ) یان ، بە کوردی ئاپۆرەشیان وتوە ، یانی کوردێک کە نە خەڵکی شار بێ ، نە رێبەری ئایینی بێ ، نە مەلا و فەقێ بێ ، نە خاوەن ملك و نە عارەب وتەنی لە ( خەواس) بێ . ماموەستا هەژاریش لە یەکێک لە هۆنراوەکانی تاریفی سەرۆک مەلا ستەفا بارزانی دا ، کە و وشەی) گۆران ) ی تێدایە ، مەبەستی لە کوردی ئاپۆرە یە ،

نەک کوردی گۆران بە گشتی یا خێڵی گۆران . ئەم ناوە تایبەتیانە لە زۆر ناوچە هەن ، وەک لە ناوچەی پاوە و دەڤەرەکەی ، هەر کەس بە زاراوەی سۆرانی قسە بکا پێی دەڵێن ( جاف ( ، کە ئەمە بەو مانایە نیە ئەو کەسە دەبێ هەر لە خێڵی جاف بێ ، بەڵکە مەبەست ئەوەیە سۆرانیە ، بەڵام رەنگە لە خێڵی جافیش نەبێ . یا لە ناوچەی باشووری موکریان ، بە خەڵکی هەوشار دەڵێن ( کورد) ، خەڵکی هەوشاریش بەمان دەڵێن موکری . یا لە شاری مەهاباد ئێستاش زۆر جار ، بە خەڵکی نا مەهابادی دەڵێن ( کرمانج) ،با سۆرانی یا گۆرانی و ئەوانەش بێ ؛ یا جاران لە زۆرناوچەی دیکەش ، بە کوردی ئاپۆرەیان دەوت " کرمانج " ، جا هەر زاراوەیەکی ببوایە . بە کورتی ئەم چەشنە ناوە ناوچەییانە، هێندە لە کوردستانی گەورە زۆرن ، کە بۆ خۆی باسێکی تایبەتی دوور و درێژی دەوێ .

## مەگەر نەتەوەی کورد چەند گەلە ؟

گشتمان دەزانین نەتەوەی بێ دەستەڵات کراوی کورد ، نەتەوەیەکە نزیکەی پەنجا میلیۆن کەس ، کە پاکیان لە رەگەزی رەسەن و قاڵی ئارییایین ، لە نێوان پێنج دەستەڵات دا بەش کراون و هێندێکیشیان ، لە دەست تەشەنە، تەنگوچەڵەمەی رۆژگار و بێ دەرەتانی ، پەڕەوازەی شەش قوڕنەی جیهان بوون و هێندە پڕش و بڵاون ، کە کورد کوتەنی وەک توی( تۆوی (هەرێز ( فریزو ) ی نێو شێوەرد ، تەنانەت دۆزینەوەشیان ، کارێکی ساکار نیە و رەنگە بە وتەی ئەستێرەناسانی کۆن ، پێویستی بە رەمڵ و ئوستوڕلاب ببێ . بەڵام ، با لێرەدا ، لە کولاندنەوەی زامی کۆنە ی بە ناسۆر کەوتو بگەرێم و بە تەپڵەوە بچمە سەر بستوی تەوەرەی باسە کە :

دیسان پاکمان دەزانین هەر تەنیا نەتەوەیەک بە ناوی کورد لە جیهان دا هەیە . بەڵام بەداخەوە ، هێندێک لەبەر ئەوەی کە فارس کوتەنی یەک جار زۆر لە نێو باغ و ماغ دا نین ، جار جار شتی سەیر دەفەرموون یا دەنووسن ، کە زۆرتر لە قسەی بن دیوار و قەشمەری دەچێ . !

بۆ وێنە لە هێندێک کەسی ئاسایی دەبیستین دەفەرمەرموون میللەت (گەل) ی هەورامی ، میللەتی کەڵوڕ ، میللەتی لوڕ ، میللەتی سۆران ، میللەتی لەک ، میللەتی کاکەیی ، میللەتی زازا ، میللەتی ئێزەدی یا میللەتی کرمانج و هتد . بەڵام لە راستی دا ئەمانە هەموویان بەشێکن لە ئەندامگەلی گەل(میللەت) ی کورد و هیچ کامیان بۆ خۆیان نەتەویەکی جودا لە گەلی کورد نین و کورد هەر یەک گەلە ، نە چەند گەل و نەتەوە . یا شێوەی ئاخەفتنی ئەوانە ، پاکی زاراوە و بن زاراوەی کوردین ، نەک هەر کام بۆ خۆی زمانیکی سەربەخۆ بێ . تەنانەت بە پێی زانستی ) anthropology مرۆڤ ناسی فیزیکی ( ، بە ختیاریەکانیش ، هەر بە کورد رەگەز دادەنرێن .

بۆ هێنانەوی چەند وێنە با بڵێم : لەدەڤەری هەورامان بە کوردە سۆرانیەکان دەڵێن " کورد " و بە وانی دیکە دەڵێن هەورامی ، کە لە راستی دا هەردووکیان هەر کوردن . یا لە هێندێک جێگەی ئەو دەڤەرە ، هەرکەس سۆرانی بێ ، پێی دەڵێن " جاف " ؟ . بەڵام ، دەبێ بزانین جاف یەکێک لە هۆزە بەرێز و مەزنەکانی کوردە ، نەک بێین بڵێین میللەت(گەل) ی جاف . لە ناوچەی باشووری موکریانیش ، کەڵوەڕە دێرامەدیەکانی ناوچەی هەوشار ، بە خەڵکی موکریان دەڵێن " موکری " و ئەمانیش بەوان دەڵێن " کورد " ، کە ئەمەش لە روانگەی زانستیەوە راست نیە و هەم مۆکری کوردە و هەم کەڵوڕ .

هەرچۆن بێ ، ئەم چەشنە هەیتوهوت و گێرە و کێشانە لە کوردستانی گەورە زۆر هەن ، بەڵام دەبێ ئەمە بزانین ، کە هیچ رگەزێکی کورد لە گەڵ رەگەزەکەی دیکە، کورد تر نیە و نەتەوەی کورد لە هەر کوێ بن ، هەر گەلی کوردن و تەنیا یەک گەل بە ناوی گەلی کورد لە جیهان دا هەیە، بەڵام ئەم گەلەش ، وەک تەواوی گەلانی دیکەی جیهان ،

زاراوه ، بن زاراوه و بگره بنی بن زاراوەی جۆر به جۆری هەیه و خاوەنی ئایینی جۆر بەجۆریشن ، که هەموویان رێز بۆ یەک دادەنێن .

## راڤەی وشەی "میر "

وشەی میر یەكێک لەو وشانەیه ، که له زمانی كوردی دا زۆر واته ( مانا) ی هەیه ، كه به كوررتی لێره دا لزگەی هێندێک له واته كان پێشكەش دەكەم :

-له زمانی كوردی دا به پادشایان وتوه "میر" ، كه ئەم وشەیه لەتەک وشەی ئەمیر دا تۆفیری هەیه . بۆ وێنه " میره گەورەی رەواندوز " ، كه نەیاران پێیان وتوه " پادشا كۆرەی رەواندوز ، واته وشەی گەورەیان كردوه به كۆره ( كۆێره ) . میره گەورەی رەواندوز ، یەكێک له دەستەڵات دارانی مەزنی كورد بوه ، كه كۆشكەكەی هێشتا له كن شاری رەواندوز به چەشنی ئاڕەفته هەر ماوه . میر ، دەستەڵاتداری به هێزی بەشێكی بەرچاو له كوردستانی گەوره بوه .بۆ وێنه لەو كاته دا پیشەسازێكی هێناوه ، تۆپی بۆ دروست كردوه ، به ناوی وەستا رەجەب . تۆپی وەستا رەجەب له مێژودا به ناوبانگه .

-له زۆر ناوچەی كوردستان رێوڕەسمێک هەیه ، به ناوی " میری نەورۆزی " ، به تایبەت ئەمە زۆر له موكریان باو بوه . ئەم رێوڕەسمە ، دوروشمێكی جوانی دێمۆكڕاسی بوه و له سەر دەمی نەورۆز دا ، " میر" یان، به چەشنی كاتی لەسەر كار لابردوه و بۆ ماوەیەک كەسێكیان كردوه به " میر . " ئەم ئاكاره كرەوەیەكی شیاو بوه و له زۆر روانگەوه زۆر قازانجی رامیاری ، كۆمەڵایەتی و شتی وای بوه . ماموەستا عوبەیدوڵلا یەییوبیان كتێبێكی سەبارەت بەم رێورەسمە نووسیوه ، تكایه ئەگەر دەرفەت بو ، بیخوێننەوه .

-به گەوره و رێبەری هاو وڵاتیه خۆشەویسته ئێزەدیەكانمان ، كه خاوەنی ئایینێكی رەسەن و كۆننی كوردین ، دەڵێن "میر . " بۆ وێنه رێزدار ، سەروەر "میر تەحسین . "

" -میر" ناویشه بۆ كوڕ ، كه زۆر تر به چەشنی " میره " دەریان بریوه . وەک " میره" بەگ ، سۆفی " میره " و هتد .

. -میر سێوەددین موكری ، پادشای موكریان بوه و به پیی پەڕتووكی شەرەفنامه ناوی موكریان له ناوی ئەوەوه رەگاژۆی كردوه . میر سێوەددین زۆر رامیارێكی هەڵكەوتو و

ناودار بوه ، هەر ئەو شتەی کە بۆ میر، سەرردارانی و رێبەرانی کورد زۆر پێویستە ، بەڵام لەبەر داب و خوی راستی و دروستی کوردایەتی تێی دا کورتیان هێناوە تەنانەت لە بەستێنی رامیارێس دا ، بەڵێن خواز بوون . بە ناوبانگترین ئەسپی کورد ، چارەوێیەک بوە بە ناوی " بۆرەی میر سێوەددین " ، کە ئەسپی ئەو بوە .

" -میر و بەگلەر " ، واتە مرۆڤگەلی مەزن و دەستەڵات دار .

-زوربەی بنەماڵە دەستەڵات دار( سیسیلە) کانی کورد، پێشگر(پێشکۆ)ی وشەی " میر " رێزناویان وابوە ، وەک : میرانی بۆتان ، میرانی موکریان ، میرانی ئەرەدەڵان ، میرانی بابان ، میرانی بۆتان ، میرانی سۆران میرانی بادینان و هتد .

" -میرم ! " ، لە زمانی کوردی دا واتە " گەورەم . "

" -میری " واتە دەستەڵات " دەوڵەت و حکومەت .

تێبینی : رەنگە ئەم پرسیارەش بێتە گۆڕێ " کە ئایا میر نشێنە کوردەکان تەواو سەر بەخۆ بوون ، یا ئەوانیش بە چەشنێک لە ژێر سێبەری دەستەڵاتی نێوەندی بەغدا یا ئەستەمبووڵ دا، وەک ناوچەیەکی موسوڵمان فەرمانڕەواییان کردوە ؟ "

بە پێی زاکوون (قانوون) و دابی ئەو کاتە ، نە تەنیا میر نشینە کوردیەکان ، بەڵکە تەواوی ئەو وڵاتانەی لە کەوشەنی دەستەڵاتی خەڵیفەی ئیسلامی بەغدا یا ئەستەمبوول دا ژیاون ، پاکیان دەستەڵاتیان لە میر نشینە کوردەکان زۆرتر نەبوە ، بۆ وێنە وڵاتی ئێرانی پێش هێرشی هولاکۆ ، شام ، میسر ، شاخی ئافریقا ، یەمەن ، عارەبستان ، وڵاتگەلی باڵکان و تەواوی ئەوانەی بە ناو لە ژێر سێبەری دەستەڵاتی بەشێک لە خەڵیفەگەری ئیسلام دا بوون ، کە ئەم سیستمە چەفت وچەوێڵی ، لە "بیگ بانگ"ی رامیاری جەنگی جیهانی هەوەڵ دا بە جارێک لە هەمو وڵاتێک ، تێک رما بەڵام لە کوردستانی گەورە ، بە لەونێکی دیکە خراپتر بو .

## ڕاڤەی وشەگەلی " ناو " و " نێو "

چون زۆر جار ، لە بە کاربردنی وشەگەلی سەرەوەدا هەڵە پێش دێ ، ڕاڤەیەکتان سەبارەت بەو وشانە لە زمانی کوردی دا پێشکەش دەکەم، کە بە هیوام ئەگەر پێتان گونجاو بو ، ئێوەش ڕەچاوی بکەن ، ئەگەر نا لەبیری بەرنەوە :

وشەی " ناو"  مانای هەمان وشەی "اسم" ی عارەبی دەدا ، کە چووشەتە نێو زمانی فارسیەوە و بوە بە " نام " . بۆیە ناڵێم لە زمانی فارسیەوە هاتوەتە نێو زمانی کوردی ، چون کوردی بە کۆنتر ، سەربەمۆرتر  و  دەست لێنەدراوتر دەزانرێ . بۆیە لە فارسی دا بوە  بە " نام " ، چون لە زۆر لەو وشانە دا کە لە زمانی کوردیەوە چوونەتە نێو زمانی فارسی ، پیتی " و  "  بوە بە " م" ، وەک " داو = دام" ، "خاو=خام" و  هتد . بەڵام وشەی " ناو  " لەگەڵ وشەی " نێو  " ، کە مانای هەمان وشەی " میان " ی فارسی دەدا ،  تۆفیری هەیە و پێویستە بە چەشنی جیاواز بنووسرێن .

لێرەدا هێندێک لەو وشانە ، کە لە وشەی " ناو"ەوە ، ڕەگاژۆیان کردوە ناو دەبەم :

ناسناو ، ناوبانگ ، ڕێزناو ( لەقەب ) ، گوم ناو ، خۆشناو ، ناوخاس ( ناوی کوڕ) ، بەد ناو و  هتد .

ئەمەش هێنذیک لەو وشانەی ، کە لە وشەی " نێو " ەوە ،  ڕەگاژۆیان کردوە  :  نێوەڕۆک ، نێوەندە ( سەنتەر) ، نێوەزێڵ ( نێوەوە ( ، نێوان ، نێوماڵ و  هتد .

بە کورتی پێویستە  لە بیرمان بێ ، کە وشەی " ناو  " ، لەتەک وشەی " نێو" دا تۆفیری هەیە  و  نابێ لێمان  تێکەڵ نەبن  .

## ناوە عارەبیە کوردێندراوەکان

پاش داسەپاندنی ناوە عارەبیەکان بە سەر زمانی کوردی دا ،  وای  لێهات کە کورد بەدەگمەن بۆی  دەلوا و ڕێگەی پێ دەدرا ناوی ڕەسەنی کوردی لە منداڵی خۆی بنێ و زوربەی ناوەکان ببوونە عارەبی ، کە زۆریان پێشگر ) پێشکۆ) ی " عەبد" یشیان پێوە بو ، وەک  "عەبدو لقەدارە " و شتی   وا . !!! تەنانەت من خۆم لە بیرمە ،  هێندێک لە سەر  بزمارە کانی ئەو کاتەی کوردستان   ،کە بە چەشنی ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ بە

دەستوپێوەندی بیرۆکەی خەلیفە و مەلیفەکانی بەغدا و ئەستەمبوول لە قەلەم دەدران ، دەیانوت هەر کەس ناوی رەسەنی کوردی ببێ ، پای ناچێتە بەهەشت و مەهەشت و بە مسقاڵ حۆری کەلەکە تەسک و بە دڵۆپ " شەرابەن تەحووری"مزری گیر ناکەوێ ، لە بن سێبەری فێنکی داری توبا دا ناحەسێتەوە و فلان و فیسار ؟ بەڵام دژ بەمانە ، گەورە پیاوی وەک مەلا خەلیلی گۆڕەومەریشمان بو ، کە چەند ساڵ تەنانەت بۆ مانەوە و نەگۆڕرانی سیپاڵی رەسەنی کوردی ، دژ بە میری ) دەولەت) ی رەزا شا شۆڕشی چەکدارانەی کرد ، کە بۆ لێکدانەوە و باس و خواسی پتر لەم کەوشەنە دا ، دەتوانن کتێبی " شۆڕشی مەلا خەلیلی گۆڕەومەر" ،لە نووسینی نووسەری دڵسوزی کورد، ماموەستا برایم ئەفخەمی بخوێننەوە . هەر چۆن بێ ، بە هۆی زۆر بیانوی داتاشراوی چەند لایەنە ، ناوی کوردیان قەلاچۆ کردو خستیانە بازنەی تەسکی تێدا چوون و زمان قڕان ( قڕکردنی زمان : (

لەو حەیس و بەیسە دا ، بۆ ماوەی پتر لە هەزار ساڵ ، کورد دەبو لەگەڵ ناوی ناکوردی بسووتێ و بسازێ . بەڵام لەم بەستێنە دا ، بە هۆی ئەوەی کە ناوی ناکوردی بۆ کورد شتێکی نامۆی فەرهەنگی بو و لە لایەکی دیکەشەوە ، لە روانگەی دەنگناسی ( فۆنۆلۆژی) ەوە زۆر باشیشی بۆ دەرنەدەبڕدران ، یانی رەوان نەبون ، زۆر لە ناوە مێوینە و نێرینە عارەبیەکانی کورداند ، کە وەک مشتێکی چکۆلە لە گشتێکی زلە ، لێرە دا هێندێکیان دەخەمە بەرچاو . دەبێ ئەوەشمان لە بیر بێ ،کە لە زوربەی ناوچەکانی کوردستانی گەورە ، بە زاراوە و بن زاراوەگەلی جۆر بەجۆر ، ئەم کارە کراوە :

ئامینە = ئامە
ئیسماعیل = سمکۆ
برایم = بلە
جەواهێر = جەوە
حاجی =حەجۆ
خضر = خلە
خەدیجە = خەجێ
رابعە = رابە
رەمەزان = رەمە
زەینەب = زێنێ
شەمسوڵڵا = شەمە
طوبا =توبی
عایشە = ئایشێ
عەبدولقادر = قالە
عەبدوڵڵا = عەبە، عەودە
عەلی = عەلانە
فاطمە = فاتە ، فاتێ ، فاتان
محەممەد = حەمە، مەمی ، محە .

مەحموود = خولە
مەعسوومە = مەحسە
نیعمەتوڵڵا = نەمە

و زۆر ناوی دیکەش کە ئەم ناوە کوردێندراوانەش ، هەر دەبێ بە عارەبی بزانین و نەبوونەتە کوردی . بەڵام ئەمە نابێ لە بەستێنی دژایەتی زمانگەلی دیکە و بیرۆکەی شێڤێنیسم دا پۆلێن بکری ، بەڵکە کردەوەیەکی نیشتمان پەروەرانە و پاتریۆتیسمە ، کە بە هەمو ئایین و فەلسەفەیەک ، بە شتێکی پێویست ، رەوا و ماقووڵ دەزانرێ .

گەلۆ ! تەنانەت کەویش ناوی تایبەتی خۆی هەیە ، وەک کەوە سەرسەوز ، کەوە کۆچەر ، کەوە خاڵ خاس و هتد . کاتێک ئەو گشتە ناوە رەسەنە شەنگە کوردیە هەن ، کورد بۆ دەبێ ناوی نا کوردی ببێ ؟

## وشەگەلی تایبەت لە زمانی کوردی دا

با وەکو گەلی کورد زۆرتر بە کۆچەری و بە دەم هەڵات هەڵاتەوە، زمان و فەرهەنگی خۆی پاراستوە ، بەڵام لەگەڵ ئەم بێ دەرەتانیەش دا، خاوەنی زمانێکی وایە ، کە تایبەتمەندی زۆر گرنگ و بەرچاوی هەیە و رەنگە ئەو تایبەتمەندیانە، لە کەم زمانی خزمەتکراوی جیهان دا ببینین .

بۆ وێنە ، وشە و لەتە رستە ( عیبارەت)ی کورتی وا لە زمانی کوردی دا هەیە ، کە هێندە وەرگێڕانیان بە زمانگەلی دیکە چەتوونە ، کە جاری وا هەیە ، بە چەند رستەی درێژ ناتوانی ، وشە یا لەتە رستەیەکی کورتی کوردی وەرگێڕیتە سەر زمانێکی دیکە ،کە ئەمە دروشمی بە پیتی و پڕواتایی زمانی کوردیە .

ئێستا لێرە دا ، بۆ ئەوەی کە بەڵگەی ئەم بیرۆکە بناسێنم و بیسەلمێنم ، چەند دانە لەو وشە یا لەتە رستانە دەخەمە بەر چاو ، کە زوربەی گەلی کورد ، مانایان دەزانن ، بەڵام وەرگێراندنیان بە وشەیەک یا لەتە رستەیەک بۆ سەر زمانگەلی دیکە ، زۆر چەتوونە یا هەر ناکرێ . کە لێرەدا بۆ وێنە ، خۆم سێ دانەیان بە زمانی کوردی شرۆڤەی دەکەم :

" -1شل و مل " ، بە مانای ئافرەتێکە ، کە بەلای کەمەوە بە تەمەنی باڵق بوون گەیشتبێ ، زۆر پیریش نەبێ ، نەرم و نۆڵ و نەرم و نیانیش بێ ، پشتوێن و لەچکە کەی شل ببەستێ و نە زۆر لەڕ بێ و نە زۆر قەڵە و هتد .

" -2بوغە " ، بە مانای جوانەگا یا گایەکی کەم تەمەنە ، کە بۆ ئەوەی شان بداتە بەر کار ، خەسێنرابێ . بەڵام لە پاش خەساندن ، دیسان باتووی هێنابێتەوە و ملی لێ ئەستوور بوبێ و سەر شانی وەک دووگ (کۆهان (ی وشتر ، هەڵماسیبێ و هتد .

" -3بنە " ، بە مانای پارگوێر ، جوانەگا ، گا ، مانگا ، گوێدرێژ یا رەیشە وڵاغێکە ، کە لە گێرە دا ، بۆ کوتینی کولۆش کەڵکی لێ وەردەگرن و لە ئاخری لای چەپی گێرەکەوە ، هەوەڵ گیانلەبەر ) حەیوان) ە.هەمیشە بێکارەترن گیانلەبەر ، دەکەن بە " بنە" ، چون وەک نوختەی جەغز ( دایرە) ، ئەو کەرسەیەکە ، وەک ئەندامەکانی دیکەی گێرە ، زۆر نیازی بە گەڕان و خولانەوە نیە و هتد .

ئێستا بە دیتنی ئەو سێ وێنەیەی سەرەوە ، بۆمان دەردەکەوێ ، کە چەند چەتوونە ، ئەو چەشنە وشە و لەتە رستانە ورگێڕینە سەر زمانێکی دیکە .

ئەمەش چەند وێنەی دیکە ، بە بێ شرۆڤە :

١- پاڵە ( لە دروێنە دا .
٢- خانومان.

٣- ڕەزاگران.
٤- زیانی .
٥- سەرە ( پێچەوانەی بنە.
٦- شەنگە بێری .
٧- قوت .
٨- قوڵتەشە .
٩- قیت و قۆز.
١٠- گەلحۆ .

## وشەگەلی بانگ کردن ( خطاب ) ، لە زمانی کوردی دا

لە زمانی کوردی دا زۆر وشە و لەتە رستە ( عیبارەت) مان بۆ بانگ کردن ( خطاب) هەیە - چ لە کاتی نووسین و چ لە کاتی ئاخەفتن دا - ، کە لێرە دا ، تا جێگەیک بیرم بڕ دەکا ، بۆ وەبیرخستنەوە و پیتاندنی زمانی کوردی، کورتە ئاماژەیەک بە هێندێکیان دەکەم :

" -دادە! = دادێ !" ، بۆ مێوینە بە کار دەبرێ ، بێجگە لە ژنی خۆدی پیاو .
" -براینە !" ، ئەی برایان .
" -بووکێ " !، بۆ مێوینەی لاو پێکەوتو بە کاردەبرێ .
" -بینەران !" ، ئەی ئەوانەی کە دەیبینن .
" -پووریّ ! " ، بۆ مێوینەی بەتەمەن بە کار دەبرێ .
" -خاتوون !" ، بۆ میوینە بە کار دەبرێ .
" -خانم !" ، بۆ مێوینە بەکار دەبرێ . "خان" بەکارنابرێ، وەک "خان چۆنی. "
" -خوشک و برایان . "!
" -خۆشەویستم !" ، ئەی ئازیزم .
" -دادی خۆم !" ، بۆ مێوینە بە کاردەبرێ ، بێجگە لە بۆ ژنی خودی پیاو .
" -دایە !" ، بۆ مێوینەی بەساڵدا چو بە کار دەبرێ .
" -دینۆ ! " ، ئەی باوەڕ و بڕوای من.

" -کاکۆ ! " ، برا . بەڵام قەت ژن بۆ مێردی خودی خۆی بە کاری نابا .
" -کوردینە !" ، ئەی کوردان .
" -کوڕە !" ، بۆ نێرینەی بەکار دەبرێ .
" -گشت کەسەکەم "! ، بۆ خزمی زۆر نزیک بە کار دەبرێ .
" -گەلۆ! " ، واتە ئەی گەل .
" -گەلی خزموبراینە ! " ئەی هەمو خەڵکان نزیک .
" -گەنجۆ !" ئەی لاوی نێرینە .
" -گەنجێنە ! " ئەی لاوانی نێرینە .
" -گوردینە " ! ، ئەی پاڵەوانگەل .
" -گوڵم ! " ، بۆ خۆشەویست بە کار دەبرێ .
" -مەردینە !" ، ئەی جوامێران و مێرخاسان .
" -مەمۆ !" ، بە مانای مامەیە و بۆ نێرینە بە کار دەبرێ . بۆ وێنە لە هۆنراوەی فۆلکلۆری کوردی دا دەڵێ " مەمۆ ! ، تووتن و بێستان و پەمۆ. "
" -میرم! " ، واتە " گەورەم " ، هەم بۆ مێوینە و هەم نێرینە بە کاری دەبەن .
" -نەنێ !" ، بۆ مێوینەی پیر بە کار دەبرێ .
" -هاو بیران ! " ، ئەی ئەوانەی وەک من بیر دەکەنەوە .
" -وەستا ! " ، بۆ پسپۆڕی نێرینەی پیشەساز و شتی وا بە کار دەبرێ .
" -یایە !" ، بۆ مێوینە بە کار دەبرێ ، واتە " ئەی خانم . "
" -بابم!" ، بۆ وێنە " بابم گوێ شل کە " ، بۆ نێرینە بەکار دەبرێ .
" -برا ! " ، بۆ نێرینە بە کار دەبرێ ، بێجگە لە بۆ مێردی خودی ژن .
" -حورمێ !" ، بۆ بانگ کرنی مێوینە بە کار دەبرێ ، یانی " بەڕێزی مێوینە."
" -خاڵۆ ! " ، ئەی خاڵە - بۆ نێرینە .
" -خوشکینە !" ، ئەی خوشکان ، بۆ مێوینە .
" -خوشکێ" ، بۆ مێوینە بە کار دەبرێ .
" -خوێنەران !" ، ئەی ئەوانەی دەیخوێننەوە .
" -خۆشەویستی خۆشەویستانم !" . واتە ئەی زۆر خۆشەویست.
" -کاکی خۆم!" ، بۆ بانگ کردنی نێرینە بە کار دەبرێ .
" -کچێ !" ، بۆ مێوینە بە کار دەبرێ .
" -کوردۆ ! " ، ئەی کورد .
" -لاوۆ ! " ، بۆ نێرینەی لاو بە کار دەبرێ .
" -هاوالان !" ، ئەی دۆستان .
-گەورەم ! " ، ئەی مرۆڤ مەزنی من .
"-مامۆستا !" ، بۆ پسپۆڕی زانستی و فەرهەنگی بەکار دەبرێ .

تێبینی : دەتوانین بە زۆر شتی دیکەش ئاماژە بکەین . ئەم وشە و لەتە رستانە دەستی نووسەر ، وێژەر ، خوێنەر و .... ئاواڵە دەکا ، تا بە کەڵک وەرگرتن لەم کەرەسە زمانانە ، بابەتەکانیان پوخت و قاڵتر بکەن . ئەگەر لە سەرەوە دا ،" بۆ نێرینە یا مێوینە" ، ئاماژەی پێ نەکرابێ ، یانی بۆ هەرردووکیان بەکاردەبرێ . ئەگەر شتەکە تۆزێکیش

نامۆ بووبێ ، بۆ رێنوێنی وێنەیەکشم بۆ هێناوەتەوە. دیارە لە زاراوە و بن زاراوەکانی دیکەی زمانی کوردی دا ، شتگەلی وا هەن کە رەنگە لێرەدا ، ناو نەبرابن .

بە هیوام ئەم شرۆڤە کورتە ، بە پیتاندنی زمانی کوردی لە قەڵەم بدەن .

## رێزناو (لەقەب) لە زمانی کوردی دا

هەر گەلێک ، بۆ رێزلێ نان لە خەڵکی خۆی ، کۆمەڵێک رێزناو ) لەقەب)ی بوە و هەیە ، کە یا وەک پێشگر ( پێشکۆ) یا پاشکۆ ( پاشگر ) لەگەل ناوەکان دا بە کار براون و دەبرێن ( زۆر جار وتنی ناو بە بێ رێزناوی شیاو ، بە شتێکی ناجوان ، ناشیرین و بێ رێزی دەزانرێ) ، بۆ وێنە " خاجە "ی فارسی وەک " خاجە حافز " یا ئەفەندی " تورکی ، وەک " دەمیر ئەفەندی " و هتد . لە زمانی کوردیش دا زۆر رێزناومان هەن ، کە هێندێکیشیان لە زمانگەلی دیکەوە هاتوونەتە نێو زمانی کوردی ، وەک " شێخ " کە لە بنەڕەت دا ، عارەبیە .

لەم لزگە ( لیست) ە دا ، برێک لە رێزناوە کوردیە کان دەناسینم یا باشترە بڵێم وەبیریان دەخەمەوە ، کە دیارە دەتوانین ئەم لزگەیە پتر بپیتێنین ، بە تایبەت بە کەڵک وەرگرتن لە زاراوە و بن زاراوە جۆربەجۆرەکانی کوردی :

ئاپۆ ، رێزناوی سەرۆک عەبدوڵلا ئوجەلان ، کە بە زاراوەی کرمانجی بە خاڵە دەڵێن .
ئاغا ، وەک قەرەنی ئاغای مامەش.
ئەندازیار ، وەک ئەندازیار زانا .

بابە ، وەک بابە گوڕ گوڕ.
باجی ، وەک باجی خاتووزین ، کە لە گوندی بۆگەبەسی موکریان ، هەوڕگەرێکی بە ناوبانگ بوە.
باوە، وەک باوە یادگار، کە گڵکۆکەی کەسایەتی جێی ڕێزی هاونیشتمانانی کاکەیی ( یارسان= یارستان) ە.
بەگ ، وەک سلێمان بەگی بانە ، کە لە گۆرانی فۆلکلۆریش دا بیستوومانە.
بووک ، وەک بووک زێنێ ، کە لە گۆرانی فۆلکلۆری دا هەیە.
پاشا ، وەک عسمان پاشای جاف .
پوورە ، وەک پوورە جەوە ، کە فۆلکلۆرە : دەڵێن" لەوەیە ، لەوەی پوورە جەوەیە، ماڵیان لە یەکشەوەیە. "!
پیر ، وەک پیر شالیاری هەورامان.
حاجی ، وەک حاجی قادری کۆیی ، هۆنەر .
خات ، خات هەمین ، کە گۆرانی فۆلکلۆریە: " خانە خوێ کەم خات هەمین ، ب لەنجە و بە لار بێ . "
خاتوون ، وەک ئەنتکیە خاتوون یا سارا خاتوون .
خالۆ ، وەک خاڵۆ قوربان – ساڵی مێژوویی خاڵۆ قوربان بە نەوبانگە.
خان ، وەک بەدر خان . تێبینی : لە باشووری کوردستان زۆر جار بۆ ئافرەتیش بەکار دەبرێ.
خانم ، وەک عادلە خانمی جاف .
خاڵە ، وەک خاڵە سوورە.
خەڵیفە ، وەک خەڵیفە مەلا محەممەدی باڵەقلۆ(بەها) ، هۆنەر.
دادە ، وەک دادە لەیلا قاسم.
دایە ، وەک دایە خانمی هەولێر.
دەروێش ، وەک دەروێش عەبدوڵڵای گۆران .
دوکتور ، وەک دوکتور فوئاد ، کە لە هۆنراوەکانی مامۆستا قانع دا باسی کراوە .
دوکتورە ، وەک دوکتورە نەسرین فەخری ، رووناکبیری کورد .
سەیید ، وەک سەیید کاکە ئەحمەدی سلێمانی ، باپیری مەحموود شا ( مەلیک مەحموود .
سەید زادە ، وەک سەید زادە خانم.
سەیدا ، بە زاراوەی کرمانجی بە سەید دەڵێن .
سۆفی ، وەک سۆفی رەحمان عەزیزی پیا چاکی بۆکانی .
شێخ، وەک شێخ بابای غەوساوا، کە عوسمانیەکان لەجەنگی هەوەڵ دا، لە گوندی کارێزەی بۆکان لە داریان دا.
فەقێ ، وەک فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە .
قازی ، وەک قازی فەتاح ،کە لە خەبات دژی رووسەکاندا گیانی لە دەست دا .
کا ، وەک کا نەبی ، کە لە بەیتی کوردی دا هەیە .
کاک ، وەک کاک مەسعوود بارزانی ، سەرۆکی هەرێمی کوردستان.
کاکە ، وەک کاکە جوانێ .

کوێخا ، وەک کوێخا حەمەشەریفی گەورە ، پیاو ماقووڵ و ردێن سپی کەڵوڕی ناوچەی هەوشار .
کوێخا ژن، وەک کوێخا ژن خەجێی کەڵوڕ .
لالە ، وەک لالە حەمە .
لالۆ ، وەک لالۆ باپیر.
مام ، وەک مام جەلال، سەرۆک کۆماری ئێراق.
مامە ، وەک مامە ریشە .
ماموەستا ، وەک ماموەستا پیرەمێرد.
مەلا ، وەک مەلامستەفا بارزانی ، رێبەری کورد .
مفتی ، وەک مفتی پێنجوێنی ، هۆنەر .
میر ، وەک میر تەحسین بەگ ، رێبەری کوردانی ئێزەدی .
میرزا ، وەک میرزا ئەولقادر پاوەیی – هۆنەری کلاسیکی کورد .
میمکە ، وەک میمکە خێڵان.
وەستا ، وەک وەستا رەجەب کە تۆپەکەی بۆ پادشای گەورەی کورد لە رەواندوز دروست کردوە .
یای ، وەک یای مروەتی مەنگوڕ .

تێبینی : ئەم لزگەیە وەک وێنەیەک لە بەکاربردنی رێزناوەکان( ئەلقاب) و وشەی رێزگرتن ، بە پێی پیتی ئەلفوبێ و بە هەڵکەوت نووسراوە ومەبەست لەوە نیە ، کە فڵان کەس لە فیسارە کەس گرنگترە یا بۆ ناوی فلانەکەسی تێ دایە و ناوی فیسارەکەسی تێ دا نیە . بەڵام بۆ ئەوەی وێنەی بەرچاو بناسێنم ، هەتا کراوە لە ناوی کەسانی ناسراو کەڵک وەرگیرراوە و ئەگەر نەشکرابێ ، ناوێکی خەیاڵی ئاساییم بەکاربردوە ، وەک " لالۆ باپیر" . بە کورتی ، لێرە دا مەبەست روانگەی زمان ناسیەکەیەتی نە شتی دیکە .

## زانکۆی بەهەشتی، تاران :

کلاسی : کوردی .

============

رۆژی : ١٣٨١/٩/٣ .

ماوەی کلاس : ١/٥ سەعات .

بەرنامەی ئەمڕۆی کلاس :

**تایبەتمەندی زۆر گرنگی ڕێنووسی زمانی کوردی :**

تا ئێستا باسی ڕێنووسی زمانی کوردی زۆر کراوە ، بەڵام بۆ ئەوەی کە تایبەتمەندیەکی هەرە گرنگی ئەم زمانە نیشان بدەین و بیسەلمێنێین ، کە لە روانگەی ڕێنووسەوە ، یەکێک لە زمانە هەرە رێکوپێکەکانی جیهانە ، لەم وانەیەدا ، وشەی فارسی ( گل ) دەکەینە نمونە و وەک بەڵگەیەکی زانستی نیشانی دەدەین ، کە هەر ئەو وشە فارسیە (گل) - ئەگەر کوردی ئەم ڕێنووسە تایبەتیەی خۆی نەبوایە - لە زمانی کوردیدا، دەبو بۆ تەواوی ئەم وشانەی خوارەوە بەگاربرایە و بنووسرایە ، جا ئیدی خۆت هەر جۆرێکت دەخوێندەوە ، بە دەستی خۆت بو و دەیان هەڵە روی دەدا :

| **ڕێنووسی کوردی** | **مانای وشەکە لە ڕستەدا** |
|---|---|
| ١-گوڵ | بە تاقە یەک گوڵ بەهار نایە . |
| ٢ -گول | ئەو کەسەی کە نەخۆشی گولی هەیە ، پێی دەڵێن گول. |
| ٣-گولە | گولە ( بە پیاوی ناشیرین و نابووت دەڵێن ) . |
| ٤-گولێ | گولێ(گولێی) ژنی، ئافرەتێکی زۆر جەبوون و ناشیرینە . |
| ٥-گوڵە | گوڵە بۆ کچان ناوێکی زۆر خۆشی کوردیە . |
| ٦-گوڵێ | گوڵێ " " " " . |
| ٧-گوڵۆ | گوڵۆ !(ئەی گوڵ ) ، تۆ بۆنت زۆر خۆشە . |
| ٨ -گڵ | ماموەستا هێمن خۆی چوەتە ژێرگڵ،بەڵام بیر و باوەڕی پیرۆزی . |
| ٩-گڵە | گڵەرەنگە ، گڵێکە بۆ رەنگ کردنی دیزەو گۆزە . |
| ١٠-گەل | بە گەل خۆشەویستی دەلێن پاتریۆتیزم . |
| ١١-گەلێ | گەلێ بەختیارم ، کە دیسان دەتانبینمەوە . |
| ١٢-گەلۆ | گەلۆ !( ئەی گەل ) یەکیەتی وشەیەکی پیرۆزە . |
| ١٣-گەلە | گەلە، گەلە ، گەلە ، هەی هەی لەو گەلاوێژە . |
| ١٤-گەڵ | گەڵی(گەڵی) عەلی بەگ ، شیوێکی زۆر جوانە . |
| ١٥-گۆڵ | گۆڵ ، بە سەگی نێر دەڵێن . |
| ١٦-گۆڵە | وەک مجێورەکەی گوندی گۆڵە وایە . |
| ١٧-گۆڵێ | بڕۆ گۆڵێ دەتناسم ، سەگێکی زۆر ترسەنۆکی. |
| ١٨-گل | ددانێ گل بکا ، چارەی کێشانە . |
| ١٩-گێل | چۆچەپیاوێکی گێل و کاس بو، هەر نەشیدەزانی مافی کورد چیە . |

٢٠-گیله		به پیاوی کاس دەڵێن گیله .
٢١- گێلێ		به ئافرەتی کاس دەڵێن گێلێ.
٢٢-گێلۆ		گێلۆ! ( ئەیمرۆڤی گێل ) تۆ کاس و گیلی .
٢٣- گێڵ		گێڵ وشەی لفەو دوانەی گەشته، وەک گەشت و گێڵ .
٢٤-گۆل		گۆل به ئەستێر دەڵێن .
٢٥-گۆلێ		گۆلێ گوندێکه له نێوان بۆکان و میاندواو.

تێبینی : ئەگەر به ڕێنووسی فارسی ئەو وشانەی سەرەوه بنووسین ، دەبێ بۆ هەمویان بنووسین ( گل) ، تەنانەت ئەگەر بشنووسین ( گله) ، دەقاقودەق ، دربڕینی وشەکان ناگەیێنێ .

## زانستی ریشەی وشه ناسی، له خزمەت زمانی کوردی دا

هەروەک دەزانین ناوی ئەم سەردەمەیان ناوه" سەدەی تەقینەوەی زانست " و ئەگەر کەسانێک بیلامانێ ، به هەڵه له تەقینەوەی زانست بۆ تەقاندنەوی خۆیان و خەڵک و تەقتەقێن کەڵک وەربگرن ، زۆرتر بەر لەهەمو کەس، خۆیان دەبنه کۆیلەی ئەو بیره چەوته و تیا دەچن .

ئێستا پاش هەڵدوورینی ئەو پەراوێزه پێویسته له سەر مژاری ئەم زانسته ، دێمه سەر بستۆی تەوەری بابەته که ، که سەبارەت به زانستی" ریشەی وشه ناسی " ، یا عارەب کوتەنی " فقه اللقه " یا Etymologyیه ، که دەتوانرێ به کەرەسەیەکی له خۆڕسکی زمان ناسی دابنرێ ، بەڵام دەتوانرێ به چەشنی ئەمرۆیی و بەربڵاو بۆ لێک دانەوه و تێگەیشتن و بگره ، ناساندنی وشەی نوی ، له لایەن تاک ، فەرهەنگستان و نێوەنده زانستیه کانی کوردیەوه ، کەڵکی لێ وەربگیرێ :

بۆ ئەوەی دەرگەی باسەکه پتر بکەینەوه ، لێره دا دو دانه وشەی کوردی ، به پێی زانستی "ریشەی وشەناسی "راڤه دەکەم و واتاکانیان لێک دەدەمەوه :

- **وشەی " هێلانه : "**
- بۆ ئەوەی بزانین ، به پێی ئەو زانسته ، وشەی " هێلانه " مانای چیه ، هۆنراوه به ناوبانگەکەی پیر شالیاری هەورامی دەکەینه بەڵگه ، که دەفەرموێ " *کەرگه جه هێڵێ ، هێڵێ جه کەرگەن " که واته مامر له هێلکەیه و هێلکه له مریشک " و دەیەوێ بەم هۆنراوەیه بپرسێ " ئایا هەوەڵ هێڵکه خولقاوه یا مریشک ؟ هەرچون بێ ، ئەم هەویره ئاوی زۆر دەوێ ، بەڵام بۆمان دەردەکەوێ له زاراوەی هەورامی زمانی کوردی دا، که به زاراوەیەکی فره بووره ( بیکر) ی کوردی دادەنرێ ، هێڵێ واته " هێلکه " و وشەی " هێلانه " به پێی زانستی

ریشەی وشە ناسی ، دەبێتە " هیل + لانە " ، کە بەمانای لانە و جگێەی هێلکە کردنی پەلەوەرەکانە .

**-وشەی " هاوسێ : "**

بۆ ئەوەی بزانین وشەی" هاوسێ" واتای چیە ،بەشەکانی ئەم وشەیە لە یەک جیا دەکەینەوە ، کە بەم پێیە دەبێتە " هاو + سێ . " بەم چەشنە دازانین کە " هاو سێ " واتە کەسێک کە لەگەڵ کەس یە کەسانی دیکە هاو سێبەرە . چون دەزانین لە زمانی کوردی دا ، "سێ " بە مانای سایە و سێبەرە و هاو سێ واتە ، کەسێک کە ماڵەکەی بە ماڵی کەسێکی دیکەوە وا نووساوە و نزیکە ، کە کاتێک ساو تاوە وسێبەری ماڵەکانیان دەکەوێتە سەر زەوی ، سێبەرە کانیان بەیەکەوەن . وەک وشەی هاوبیر ، هاو ژین ، هاو ماڵ و هتد .

خۆزگە فەرهەنگ نووسانی زمانی کوردی ، لە ناساندن و راڤە کردنی هەر وشەیەک دا ، لە روانگەی ریشەی وشە ناسیشەوە ، وشەکەیان شرۆڤە بکردایە ، کە زۆر بە شتێکی پێویستی ئەمڕۆیی دەزانرێ .

* رۆونکردنەوە ، چون ئەم هۆنراوەیەی پیر شالیار سینگ بە سینگ هاتوە ، بە چەند لەونی دیکەش نووسراوەتەوە .

# زمانه وانی کوردی



مامۆستا ح.س. سۆران